





ڕۆمان

# پەپوولە و زەنگۆڵە نوقومبووەکە



یاداشتێکی خەمناک، شاعیرانە، پڕ لە ئارەزوو و تەوسئامێزی ئەو پیاوەی کە نەیدەویست ڕۆحی بمرێت

جین دۆمینێک باوبی

لە ئینگلیزییەوە: زۆزک ئومێد

پڕۆژەی چاپی کتێبی مێخەک

زنجیرەی کتێب:٤٩

***

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە: سۆران خالد







---

کتێب: پەپوولەو زەنگۆڵە نوقومبووەکە

بابەت: رۆمان

نووسەر: جین دۆمینێک باوبی

لە ئینگلیزییەوە: زۆزک ئومێد

چاپ: یەکەم

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (٣٧٠ )ی پێ دراوە.

ساڵی چاپ: ٢٠٢٠

چاپخانە: مێخەک

نرخ: ٣٠٠٠ دینار

---



---

mexekbooks@gmail.com ٠٧٥٠٤١٤٥٢٥٠ facebook/ktebfroshymexak

---




سەرنووسەری پێشووی گۆڤاری فرێنچ ئێلی، جین دۆمینیک باوبی، لە تەمەنی چل و سێ ساڵیدا دوای توشبوونی بە نۆبەی مێشک، دووچاری نەخۆشی ئیفلیجبوون بوویەوە. دوو ڕۆژ پاش چاپی فەرەنسی کتێبەکەی کۆچی دوایکرد.

بۆ منداڵەکانم، دیۆفیل و سیلێست

وە سوپاسی بێپایانم بۆ کلاودی میندیبێل، گەورەیی کارەکەیتان لەکاتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا بۆ دەردەکەوێت.

# پێشەکی

لە پەردە کۆنەکەی پەنجەرەی ژوورەکەمەوە ڕووناکیەکم لێ دیارە. ڕووناکیەکی سپی هەڵگەڕاوی مۆن، کە هەواڵی هەڵهاتنی ڕۆژێکی نوێی بۆ هێناوم. پاژنەکانم ئازارێکی بێوچانیان هەیە، سەرم خراپ ئاوڵساوە و شتێکی زەبەلاحیش وەکو زەنگۆڵەیەکی نوقومبووی ون دەستی بەسەر هەموو لاشەمدا گرتووە. وردە وردە ڕووناکی ژوورەکەم دەتەنێتەوە و منیش بە خاووخلیچکی چاوم بە هەموو شتێکی ژوورەکەدا دەگێڕم: تەمەشای وێنەی کەسە خۆشەویستەکانم، نیگاری منداڵەکانم، پۆستەرەکان و وەهەروەها ئەو پاسکیلسوارە بچووکە لە تەنەکە دروستکراوەی کە هاوڕێ خۆشەویستەکەم ، پێش دەستپێکردنی پێشبڕکێی پاسکیلسواری پاریس – ڕوباکیس - بۆی هێنام ، ئەو ئامێرەی کە لە ژوورەکەمدا ئاوی پێدا هەڵواسراوە ، ژوورێک کە بۆ ماوەی شەش مانگە بەندم تێیدا شێوەی قرژاڵێکی ڕەبەن کە چووبێتە ناو بەردێک و بڕیاریدابێت ئیدی نەیەتە دەرەوە و ناخۆشی مردنەکەشی لەوێدا بچێژێت.

هیچ پێویست ناکات زۆر بکۆڵمەوە لەم شوێنەی ئێستام، یان بیربکەمەوە لەو ژیانەی کە پارساڵ لە مانگی دیسێمبەر و ڕۆژی هەینیدا هەر وەکو تۆز و خۆڵێک فووی لێبکرێت بەبادا چوو و ونبوو.

تا دوای ڕووداوەکە وشەی لاسکی مێشکم نەژنەفتبوو. دوای ئەوە فێربووم کە لاسکی مێشک پارچەیەکی سەرەکی کۆمپیتەرە ناوەکییەکەمانە و بەشێکی جیانەکراوەی نێوان مێشک و درکەپەتکە. کاتێک ڕووداوی گیرانی شادەمارەکانی مێشکم، بۆ هەمیشە لاسکی مێشکمی لەکارخست، ئەوجا لە ئیشە گرنگەکەی ئەم ئەندامە تێگەشت . لە پێشتردا بە " نۆبە زەبەلاحەکە " ناسرابوو، کە دەمودەست گیانی لێ دەسەندێت و دەمردیت. بەڵام لە ئێستادا بەهاوکاری تەکنیکگەلێکی پێشکەوتووی ژیاندنەوە دەتوانرێت ژیانت بۆ درێژ بکرێتەوە و ئازار و ئەشکەنجەکانت بۆ قاڵبکرێت. بەهۆی ئەو ئامێرانەوە ڕزگارت دەبێت، بەڵام ڕزگاربونێک کە پێی دەڵێن نەخۆشی " قووفڵبوون "، لە نووکی پێتەوە هەتا تەپڵی سەرت ئیفلیجە، وەکو ئەوە وایە لە جەستەی خۆتدا بووبیت بە زیندانییەک، نە دەتوانیت قسە بکەیت و نە دەتوانیت بجولێیت، تەنها مێشکت کاردەکات. لەم حاڵەتەی مندا پێڵوی چاوی چەپم هەموو پەیوەندییەکی منە لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا. بێ شک ئەوەی کارەساتەکەی بەسەردا هاتووە کۆتا کەس هەواڵی دڵخۆشکەر دەبیستێت. بیست ڕۆژ لە حاڵەتی بوورانەوەی تەواودابووم، پاش ئەوەش چەند هەفتەیەک لە خەوبردنەوە و لاوازیەکی ئێجگار زۆردا بووم، دوای ئەم هەموو شتە زانیم من چەند زیانم بەرکەوتووە. هەتا کۆتاییەکانی جەنیوەری هۆشم بەبەرنەهاتەوە. ئەو کاتەی بەئاگاهاتم لە ژووری ١١٩ی خەستەخانەی ناڤال لە بێرک-سور-مێر لە قەراخ دەربەندی فەڕەنسی بووم، هەمان ئەو ژوورەی کە ڕووناکیەکە بەرە بەرە تۆوەکانی خۆیی تێدا دەچێنێت و منیش لێوەی دەنووسم.

ڕۆژێکی ئاساییە. زەنگەکانی کەنیسەکە چارەک لەدوای چارەک لێدەدەن و کات بیری خەڵکی دەخەنەوە. بۆری هەناسەی خوێن تێژاویشم هەرچەندە شەو خاتریگرتم، بەڵام ئێستا دەستیکردوەتەوە بە خرە خرە ناسازەکەی. دەستەکانیشم لەسەر چەرچەفە زەردەکە لوول بوون و ئازارم دەدەن. نازانم بۆ ئازارم دەدەن، نازانم ئێستا وەکو سەهۆڵ ساردن، یاخود وەکو ئاگر گەرمن، بێجگە لە ئازار هەست بە هیچ شتێکی دیکە ناکەم. بۆ ئەوەی لەم ڕەقبوونە ڕزگارم بێت، خۆم دەجوڵێنم، دەست و قاچەکانم بە ئەستەم دەجوڵێن، بەڵام قەیدی نییە، چونکە هەندێجار بەو جوڵانەوەیە ئارامییەک دەدەم بە دەست و قاچەکانم.

زەنگۆڵە نوقوومبووەکەم کەمێک نەرم دەبێت و مێشکیشم شێوەی پەپولەیەک دەستدەکات بە فڕین. ئەگەر وەکو من لە جێگادا کەنەفت و ئیفلیج نەکەوتبیت، دەتوانیت زۆر شت ئەنجام بدەیت، دەتوانیت پیاسەیەک بەنێو بۆشایی گەردوون و کاتدا بکەیت، یان بڕۆیت سەرێک بدەیت لە تێرا دێل فوێگۆ یان دادگاکەی میداسی پادشا.

دەتوانیت سەردانی مەعشووقەکەی نێو دڵت بکەیت، بەلایەوە دابنیشیت و دەست لە کووڵمە خەواڵووەکانی بدەیت. دەتوانیت قەڵایەک لە ئیسپانیا دروستبکەیت و لە فلیس زێڕ بدزیت و بچیت ئەتلانتیک بدۆزیەوە و خەون و خولیاکانی کاتی منداڵی و هەرزەکاریت بەدیبهێنیت.

تەواو ئیدی زۆر لەسەری ناڕۆم. کاری هەرە گرنگم بریتیە لە نوسینی نامەگەلێکی لەسەر جێگە نووسراو. هەتا بریکاری کتێبەکەم دەگاتە ئێرە، دەبێت من خۆم ئامادە بکەم بۆ ئەوەی پیت بە پیتی نامەکەی بە ئاماژەی پێڵوی چاوی چەپم پێبدەم. لە مێشکمدا هەر ڕستەیەک دە جار لێکدەدەمەوە، وشەیەک دەسڕمەوە، هاوەڵناوێک زیاد دەکەم، وە بڕگە بە بڕگەی نووسینەکانم بە مێخی دڵ و گیانمدا دەچەقێنم

کاتژمێر حەوت و نیوە، پەرستارەکە دێتە ژوورەوە و ڕێژنەی بیرکردنەوەکانمدەپچڕێنێت. وەک ڕێورەسمێکی بێتامی سواو دێت و پەردەکە دەکاتەوە و پشکینین بۆ دڵۆپەی ئاو و دەرچەی هەوای ژێر ملم دەکات و تەلەڤیزیۆنەکەم بۆ هەڵدەکات تا ئاگاداری هەواڵی ڕۆژانەی دەرەوەی نەخۆشخانەکە بم. ئێستا تەماشای فلیم کارتۆنێک دەکەم کە باسی سەرکێشیەکانی بۆقێکی ڕۆژئاوایی دەکات. باشە چی دەبێت داوا بکەم ببم بە بۆقێک؟ ها چی دەبێت؟

## کورسیە پێچکدارەکە

تا ئێستا لە ژوورە بچووکەکەمدا هێندە مرۆڤی چاکەتلەبەری سپیم نەبینی بوو. تەواوی پەرستار و دەروونزان و پزیشکانی نەخۆشی دەمار و فێرخوازەکان نوێیەکان و بگرە بەڕێوبەری گشت نەخۆشخانەکەش هاتبوون بۆ دیتنی ئەنجامی ئەو ڕووداوەی بەسەرم هاتبوو. کاتێک هەموویان بە هەڵپە هاتنە ژوورەوە و فەرمانی گواستنەوەکەیان پێبوو، وامزانی دەبرێمە دەرەوەی ژوورەکە بۆ ئەوەی کەسێکی دی لەشوێنی من دابنێن. ئەوە ماوەی چەند هەفتەیەکە لە بێرک-سور-مێرم و ڕۆژ بە ڕۆژ هۆشیاریم زیاتر دەکات. بەڵام تا ئێستا نازانم پەیوەندی نێوان من و ئەو کورسیە پێچکدارەی لەسەریم چییە.

تا ئێستا هیچ کەس وێنەیەکی ڕوونی ئەم حاڵەتەی پێنەداوم، نازانم چۆنم. بەڵام بەپێی ئەو لەزگە و کارە برینپێچیانەی سەرم بێت، ئەوا زۆرناباتە دەتوانم دووبارە بجوڵێم و قسان بکەم.

لە ڕاستیدا هەزار پرۆژە مێشکمی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو. پرۆژەکانیش وەکو: ڕۆمان، گەشت و ئامادەکردنی کۆکتێلێکی میوە کە داهێنانی خۆمە، ( داوای ڕەچەتەکەم لێ مەکەن چونکە لەبیرم چووەتەوە.) یەکسەر جلەکانیان کردە بەرم و پزیشکی نەخۆشی دەمار بە ئاوازێک کە خۆهەڵکێشانی پێوە دیاربوو ووتی (بەهیوای ئەوەی وورەی بێتەوە بەرخۆی). جارێ من دەتوانم قسەیەک بکەم؟ زۆر خۆشحاڵ دەبووم گەر ئەم جلە زەردە لایلۆنەی بەرم بگۆڕیایەتەوە بە

تیشێرتێکی خەت خەتاوی و پانتۆڵێکی کۆن و بلوزێکی کەمێک فش- هەرچەندە بۆم دەبووە کابووس گەر شتێکی بەو شێوەیەم لەبەر بکردایە. بەڵام قەیدی نییە، خوا دەکات لەدەست ئەم جلە ناقۆڵایە نەجاتم دەبێت. یان هەر تەماشای جلەکانم بکردایە، بمبینیایە چۆن جلەکان دەکەنە بەر ئەم دەست و قاچە قورسە مردووەم کە تاکە سوودیان ئازاردانی منە.

لە کۆتایدا جلەکانیان لەبەر کردم و ئێستا کاتی دەستپێکردنی ڕێوڕەسمەکەیە. دوو لە چاودێریکەرانم لە قۆڵ و قاچەکانمەوە گرتیانم و لەسەر جێگە خەوەکەم بەرزیان کردمەوە، وە بێ ڕێزانە منیان خستەسەر کورسیە پێچکدارەکە، وەکو بڵێی زبڵ و خاشاک بم و بمخەنە ناو زبڵدانێکەوە. هەنگاوێکی باشم نابوو، لە نەخۆشێکی بێسەروبەرەوە بە فەرمی بووم بە نەخۆشێکی چوارپەل ئیفلیج. ئەوان چەپڵەیان بۆ لێنەدەدام، بەڵام پێیان دەوتم کە باشم هێناو،ە پێیان دەوتم کە چاکە بەم زیانە کەمە قوتارم بووە! خزمەتکارەکانم بەدرێژایی قاتەکە گەڕاندیانم بۆ ئەوەی بزانن ئاخۆ شوێنی دانیشتنەکەم هیچ ڕەقبوونێکی لەناکاو لە لەشمدا دروست دەکات. بەڵام ئەم ڕەفتارەیان منی گەیاندە ئەوپەڕی بێ ئومێدبوون و ڕوخان ،چونکە هیواکانی داهاتوومیان بەشێوەکەی زۆر دڕندانە دەشکاندەوە و بەکەم سەیریان دەکرد، وە زیاتر دەیانکردمە جێی تێبینی کەسانی تر. دەبوایە سەرینێکی تایبەت لەژوورسەرم دابنێن، لەبەر ئەوەی ملم دەکەوێت بەملاولادا ڕێک وەکو ملی ژنێکی ئەفریقی کە چەندین ئەڵقەی بۆ ماوەیە چەند ساڵێک لەملدا بوویێت و دواتر لایبردبێت. دەرمانکارەکەشم بە زەردەخەنەیەکی پلاستیکیەوە کە هێمای

هەواڵێکی خۆشی پێوەبوو ووتی "دەتوانیت کۆنترۆڵی کورسیە پێچکدارەکە بکەیت"، بەڵام ئەم قسانەی بۆ گوێیەکانی من وەکو وتنی "تۆ هەتاهەتایە زیندانیت" وابوو. کاتێک بەجێیانهێشتم، لە چرکەیەکدا ڕاستیەکی زۆر ترسناک و تاڵم بەرچاو کەوت، کە ڕووناکی وەکو شەوقی بۆمبی ئەتۆمی بەهێز بوو، وە تیژیەکەشی وەکو نووکی سەری ڕمێک.

کاتێک کە سێ خزمەتکارەکە خستمیانەوە جێگەکەی خۆم، بیرم لە چەتەکانی ناو فیلمەکان دەکردەوە کاتێک هەر بە زۆر دەیانەوێت لاشەی کەسە قوربانیەکە بئاخننە نێو قونی ئۆتۆمۆبێلەکەیانەوە. کورسیە پێچکدارەکەمیان وەکو هەموو شتێکی تر لە سووچەکەدا گۆشەنشینکرد و بەتەنها بەجێیان هێڵا. وە جلەکانیشم ڕووپۆشی پلاستیکە ڕەشە-شینباوەکەی سەر کورسیەکەی گرتبوو. پێش ئەوەی کۆتا چاکەتلەبەر بەتەنها بەجێمبهێڵێت، بە ئاماژە پێموت کە دەخوازم تەلەڤیزیۆنەکە بە کزی پێبێت. لەسەر شاشەی تەلەڤیزیۆنەکە ئەو بەرنامەیەم بینی کە باوکم زۆر کەیفی پێدەهات. لەوە خۆشتر، هەر لە بەیانیەوە نمەبارانێک بێ وەستان خۆی دەکێشێ بە پەنجەرەی ژوورەکەمدا.

جیاواز لە پێشبینیەکان، زۆر سوودم کورسیە پێچکدارەکە بینی. شتەکان زیاتر لەبەرچاوم ڕوونبوونەوە. وازم لەو پلانانە هێنا کە بیرقویاق و کەشوفشێکی پێوە دیاربوو، وە هەروەها هەوڵمدا لەو هاوڕیانەشم دووربکەومەوە کە دیوارێکی خۆشەویستیان بەدەورمدا کێشابوو لەو کاتەوەی کە کاریگەریەکانی کارەساتەکە بە ڕوونی لەسەرم دەرکەوتبوون. بە کورتی: ئیدی گوێم نەدا بەوانەی کە گرنگیان پێنەدەدام. پاش ئەوەی نەخۆشی " قوفڵبوون "یش ئەو یاساغی و ڕەونەقەی خۆی لەدەستدا، ئێمەش دەربارەی نەخۆشیەکە قسەمان کرد. پێش هەموو شتێک، نەخۆشیەکی ئێجگار دەگمەنە. ئەم قسەیەی دەیکەم تۆزێک ترسەکەتان دەڕەوێنێتەوە، بەڵام ئەگەری توشبوون بەم نەخۆشیە نەفرەتیە وەکو ئەگەری بردنەوەی یانسیبێک وایە. لە بێرک-سور-مێر تەنها دوو کەس دووچاری نەخۆشی "قوفڵبوون "بووین، یەکێکیان من و ئەوی دیکەشیان قوڕبەسەرێکی دیکە. بۆیە هێندە دڵم بە خۆم ناسوتێت. هەرچەندە پزیشکانیش لە بابەتی تیمارکردنی سەرمدا دەستەوەستانبوون، بەڵام دەتوانم سەرم کەمێک بجوڵێنم. هەرچەندە زۆربەی تووشبوان بەم نەخۆشیە لەڕێگەی ڕووەک و سەوزەواتەوە درێژە بە ژیانیان دەدەن، بەڵام هێشتا تێگەشتن لە شێوازی پەرەسەندنی ئەم نەخۆشییە شتێکی نەزانرا و نەکردەیە. تەنها ئەوە دەزانرێت کە ئەگەر مێشک بڕیاری دایەوە دووبارە بکەوێتەوە کارکردن، ئەوا خێراییەکەی بەقەد گەشەی

مووییەکە کە بنکەکەی لەسەرخودی مێشک داکوترابێت. بەگوێرەی ئەم زانیاریانە بێت دەبێت من چەند ساڵێکی ڕەبەق چاوەڕێ بکەم تا فرتەفرتێک بە پێیەکانم بکەم.

لە ڕاستیدا تەنها هەناسەدانەکەم بۆ ماوەتەوە. ئەو هەوایەی کە هەڵیدەمژم و دەیدەمەوە بووە بە تەنها هۆکاری بەهیوابوونم لەم ژیانە ناچیزەدا. وە لە ماوەیەکی دووریشدا هیوام وایە کەمێک خواردنەکەم ئاسایی بێتەوە، مەبەستم ئەوەیە لەڕێگەی بۆریەوە ژەمەکانم نەخۆم. لە کۆتایدا لەوانەیە بتوانم بەبێ یارمەتی ئامێرەکان هەناسە بدەم و بتوانم لەڕێگەی گەرووەمەوە دووبارە ئاواز ببەخشمەوە بە ژێیەکانم دەنگم.

بەڵام لە حاڵی ئێستامدا گەر بتوانم ئەو تفەی کە لەناو دەممدا وەکو هۆردوویەکی سەربازی دێت و دەچێت قووتبدەم، ئەوا دەبم بە بەختەوەرترین پیاوی سەر ڕووی زەوی. تەنانەت پێش هەڵهاتنی یەکەم تیشکی خۆر لە مەشقکردندام بۆ ئەوەی بتوانم زمانم بدەم لە مەڵاشوم. بەهیوای ئەوەی دووبارە توانای قوتدانم بۆ بگەڕێتەوە. شتی تر زۆر هەیە کە خۆمی پێوە مەژغوڵ بکەم. بۆ نموونە ئەو پاکەتە بچووکانەی کە بوغوردیان تێدایە و هەڵواسراون بە دیوارەکەدا بۆ قورقوڕاگەم بەکاردەهێنم، بۆ ئەوەی هەستی تام و بۆنکردنم دووبارە بۆ بگەڕێتەوە. تەماشای ئەو چاوەزارە تەلیسماویانە دەکەم کە هاوڕێ دیندارە گەشخوارەکانم لە یابانەوە بۆیان هێناوم، چاوەزارەکە لەو بەردانەیە کە هاوڕێکانم لەکاتی گەڕانەکەیاندا لە مۆنۆمێنتی مەسیحیاندا بەرچاویان کەوتبوو. هیوا لە هەموو شتێکدا دروستدەکەم،

لەبەر ئەوەی لە هەمـوو سـووچێکی جیهـانەوە بەنـاوی مـنەوە داوا لە خواوەندەکان دەکرێت بۆ ئەوەی بەخشندەتربن ، منـیش هەوڵدەدەم ئەم وزە ڕۆحیـانە ڕێکبخەم و سـوودیان لـێ ببنیـنم. ئەگەر پێم بڵێن لە کڵێسـە بچکۆلەکەی بریتـۆن لەخاتر چـاکبوونەوەی مـن مۆمیـان داگیرساندوە و لە پەرستگای نیپاڵیس سروودێکم بۆ خوێندراوە، ئەوا یەکسەر دوو ئەرکی ڕێکوپێک دەدەم بەو ڕۆحەی کە دووعایان بۆم کـردووە. ژنێکـیش کە دەیناسـم نـاوی منـی خستۆتە نـاو لیستی دوعاکانی پیاوچاکێکی کامیرۆنی بەهیوای ئەوەی شیفا و نیازی خواوەندەکانی ئەفریقام بۆ بەدەستبهێنێت، بۆ ئەو کارەش چاوی ڕاستم کردووە بە قوربانی. بۆ کێشەی بیستنیشم پشتمبەستووە بە پەیوەندەی نێوان خەسـووە ئیمانـدارەکەم لەگەڵ قەشـە ڕەبەنەکـانی پەرستگای بۆردێۆکس. ئەوان جار جار نوێژ و دوعاکانیان بۆ من تەرخاندەکەن و منیش ناوە ناوە خۆم دەخزێنمە ناو ئەو ویردانەیـان کە بۆ ئاسمانەکان لەشەقەی باڵیان داوە. بەڵام ئەنجامی ئەو ویردانە هێشتا بەرچاو نییە و خـۆی نەسـەلماندووە. بەڵام کاتێـک حەوت بـرای یەک ڕەنـگ لەلایەن هندۆسیە توونـدڕەو و دەمارگیرەکـانەوە سـەربڕدران، ئەو کـات گوێیەکانم چەند ڕۆژێک ئازاریاندام . بەڵام ئەم هەمـوو دوعـا زل و زەبەلاحانە وەکو شوورایەکەی قوڕین و دیوارێکی لمین وان لەچاو ئەو پاڕانەوە بچووکـانەی کە کـچە وردیـلەکەم بۆم دەکـات پێش ئەوەی شەوان چاوەکانی لێکبنێت. لەبەر ئەوەی هەردووکمان لە یەک کاتدا خەومـــان لێـــدەکەوێت، مـــن بەو دووعـــا و ویـــردە قەشـــەنگ و تەلیســـماویانەی ئەوەوە دەچـــمە نـــاو شانشـــینی خەوەکـــان، لەوێ ئەو تەلیسمانە دەبێت بە قەڵغانێک و لە هەموو ئازارێک دەمپارێزێت.

# کاتی شوشتن

کاتژمێر هەشت و نیوە و دەرمانکارەکەم گەیشتە لام. ناوی بریگیتە، خاوەن لەشولارێکی وەرزشی ڕێک و دەموچاوێکی شێوەی شاژنی ڕۆمایە. دێت لێرەدا مەشق بە دەست و قاچەکانم دەکات. بەم شێوازە ڕاهێنانە دەڵێن "بزواندن"، دەستەواژەکە ئەو توانایەی کە هەیەتی زۆر کەمترە لەچاو ئەو جەنگەی کە ڕووبەڕووی بووەتەوە، لەبەر ئەوەی لەماوەی ئەم بیست هەفتەیەدا ٦٦ پاوەندم (٣٠ کیلۆگرام) کەم کردووە. کاتێک دەستم بە خۆگرتنەوە لە خواردن کرد، کە دەکاتە هەفتەیەک پێش ڕووداوەکە، چاوەڕێی ئەنجامێکی هێندە بەرچاو نەبووم. لە کاتی ڕاهێناندا بریگیت بەهیوای ئەوەیە بچووکترین بەرەوپێشچوون لەمندا ببینێت، پێم دەڵێت "هەوڵ بدە دەستەکانم بگوشیت". هەندێ جار وەهمێکم بۆ دروستدەبێت و وادەزانم دەستەکانم دەجوڵێنم، هەموو وزە و ورەم یەکدەخەم بۆ ئەوەی بتوانم پەنجەیەکیشی بگرم، بەڵام زوو هەست بە بێتواناییەکەم دەکات و دەستم لەجێی خۆی دادەنێتەوە. ڕاستی بڵێم، ملم تەنها نیشانەی گۆڕانکاریە لە جەستەمدا، دەتوانم نەوەد پلە بیسوڕێنم و لە سەقفی ژوورەکەی بەرامبەرمەوە هەتا زمانی ئەو میکی ماوسەی سەر دیوارەکە ببینم، ئەو میکی ماوسەی کە دیۆفیلی کوڕم دروستی کردبوو لە کاتێکدا هێشتا توانای دەمکردنەوەم نەبوو. لە ئێستادا دوای مەشقپێکردنێکی زۆر و زەبەندە گەشتوین بەو قۆناغەی مژ مژە بکەنە ناو دەممەوە. وەکو پزیشکە دەمارزانەکە دەڵێت "پێویستە زۆر ئارام و لەسەرخۆ بین

".کۆتا ڕاهێنانیش ئەوەیە بریگیت دەموچاوم بۆ بشێلێت. دەستە نەرمانەکانی لەسەر دەمووچاوم دێن و دەچن، بەسەر شوێنە سڕ و بێتەزووەکانمدا گەشتدەکات و لەلای منەوە وادەردەکەوێت کە دەستی لە پارچە قوماشێکی ئاوریشمی دروستکرابێت،.وە ئەگەر شوێنێکی دەموچاویشم هەستی تێدا مابێت ئەوە یەکسەر هەمان شوێن گرژ دەکەم. لەو کاتەوەی هێلکارییەکانی لای دەمم تێکچوون، تەنها توانای ئەوەم هەیە هێندەی نیو زەردەخەنە دەمم بکەمەوە ،زەردەخەنەیەک کە نیشاندەری حاڵەتە خۆش و ناخۆشەکانی ژیانمە. ڕووداوێکی سادەی ژیان توانای بەگەڕخستن و چالاککردنی کۆمەڵێک هەست و سۆز هەیە.

ڕۆژێک لە ڕۆژان، بۆ نمونە لە تەمەنی چل و پێنج ساڵیدا، پێمخۆشە وەکو کۆرپەیەکی ساوا پاکوخاوێن بکرێمەوە و قومارتەبکرێم. تەنانەت خۆشیەکی بێپایان زۆر دەبینم لەوەی گەڕاومەتەوە تەمەنی ساوایی. بەڵام دووبارە بوونەوەی ئەم کردارە هەموو ڕۆژێک دەبێت بە خەم و خەفەت و ئازارێک کە توانای لەژێربارەدەرچوونیم نییە. فرمێسکێک لە دەموچاوی ئارەقاوی پەرستارەکەوە بازدەداتە سەر ڕوومەتم و جێی خۆی خۆشدەکات. هەموو هەفتەیەک دەمخەنە ناو تەشتە گەورەکە و دەمشۆن، هەر ئاو بەسەرداکردنێک وەکو ئەوە وایە لە یەک کاتدا نوقمی دڵ تەنگی و دڵگوشادی بم. ئەو ساتە دلگیرەی کە نوقمی نێو بانیۆکە دەبم یەکسەر خۆشی و لەززەتە نەبڕاوەکانی ژیانی پێشومم وەیاد دێتەوە. ئەو کاتانەی کوپێ قاوە بە دەستەکانمەوە بوو، لەگەڵ کتێبێکی باش یان تۆپەڵێک ڕۆژنامە بۆ چەند کاتژمێرێک لەنێو بانیۆکەدا

دەمامەوە و بە قاچەکانم بەلوعاکانم دەکردەوە و دامدەخستن. کە بیر لە خۆشیەکانی ژیانی پێشووم دەکەمەوە هەست بەم حاڵەتە بێ بەزەییەی و ناسازەی خۆم دەکەم. بەخۆشحاڵیەوە هیچ کاتێکم نییە بۆ بیرکردنەوە تاریک و نوتەک و ئومێدبڕەکان. خەریکن لەسەر جێ خەوە پێچکدارەکەم دەمبەنەوە بۆ ژوورەکەم، لە سەرمان خەریکم دەتەزم، بەڵام لەسەر ئەم جێگەیە زۆر ئاسوودە و ئیسراحەتم. دەبێت بۆ کاتژمێر دە و نیو پۆشتە بم و ئامادەبم بەرێکەوتن بن بۆ سەنتەری ڕاهێنان. ئەو پۆشاکە ناشرین و دێزەی نەخۆشخانەم لابردووە و ئێستا وەکو قوتابییەک جلم پۆشیوە. هەر وەکو بانیۆکە جلە کۆنەکانیشم یادەوەری تاڵ و تیژ و ناخۆشم بیردەخەنەوە. من لە جلوبەرگدا سیمبولێک دەبینم کە ئاماژە بۆ بەردەوامی ژیان دەکات، بەڵگەیەکە پیشانی دەدات کە من هێشتا دەمەوێت خۆم بم. دەمەوێت خۆم بە زیندوویی ببینم. ئێستا و لەم حاڵەتە ناخۆشەی ژیانتدا جلوبەرگ بووەتە کێشەی دەرەکیت؟ بەڵێ، چونکە ئەگەر تەپاوتلیشم کرد، دەمەوێت لەسەر قوماشێکی کشمیری نەرمونۆڵ تەپاوتل بکەم.

## ئەلفوبێ

زۆر دڵـم بە ئەلفـوبێیەکەم خۆشـە. لە شـەودا، کاتێـک لە تـاریکی نوتەکی شەوەزەنگدا نوقتەی سەر شاشەی تەلەڤیزیۆنەکە بووەتە تەنها هێمای ژیان لەلای من. بزوێن و نەبزوێنەکان بە ئاوازی گۆرانیەکەی چارلس ترێنێت کە دەڵێت " ڤینسی ئازیز، ڤینسی شیرین، بۆ هەمیشە لەبیرمدایت..... " دەست لەناو دەست دەکەونە سەما و بە ژوورەکەدا هاتوچۆ دەکەن. بەدەوری جێخەوەکەمدا خولێک لێدەدەن دواتر بەلای پەنـجەرەکەدا تێـدەپەڕن و لەسـەر دیـوارەکە دەلەرێـنەوە لە کۆتاییـدا دەرگاکە دادەخەن و پاشان دیسان دەستپێدەکەنەوە.

ێ س ا ر ن ت و ل ۆ م د پ ف ب

ڤ ە گ ج ق ز خ ک ی

ئەم شێوازە شێواوەی ڕیزبوونی ئەلفوبێیەکەم هەڕەمەکەی نییە. ئەوە نییە بڵێیت لەخۆوە وایلێهاتبێت، بەڵکو زادەی ژمێریاریەکەی ورد و زیرەکانەیە. زیاتر لە نمایشێکی پیتەکان دەچێت لەوەی لە ئەلفوبێ بچێت، هەر پیتێک لە ڕیزەکەدا بەپێی لەرەلەرەی پیتەکە لە زمانی فەڕەنسیدا دانراوە. لەبەر ئەوەیە کە "ێ" بە کەشوفشێکەوە لە پێشی پێشـەوەیە و "ی"یـش کۆتـا جێـی بۆخـۆی گرتـووە. "ب" گەلێـک داخلەدڵە لەبەر ئەوەی کراوە بە دراوسێی" ڤ"، وە "ج"ی لووتبەرز و

لەخۆبایش - کە زۆرترین ڕستە لە زمانی فەڕەنسیدا پێکدەهێنێت - هێشتا سەراسیمەیە لەوەی چۆن دەبێت ئەم لە نزیک کۆتایی کۆمەڵەکەدا بێت. "گ"ی زرت و قەڵەویش بە دانانی لەپاڵ "ە"دا قەڵسبووە. لە کاتێکدا " ت" لەگەڵ "و"دا زۆر ئاسوودە و دلگوشادن کە لە یەکتری جودا نەکراونەتەوە. ئەم هەمـوو هەراوزەنـایە مەبەستێکی لەپشتەوەیە، ئامانجەکەش ئاسانکارییە بۆ ئەو کەسانەی کە دەخوازن لەگەڵ من بدوێن.

سیستەم و ڕێکخستنێکی گەلێک سادەیە. ئەم ئەلفابێتە بە( ێ س ا )دەستپێدەکات نەک بە ئەی بی سی)، تۆ دەستدەکەیت بە خوێندنەوەی دانە بە دانەی پیتەکانی ئەلفوبێیەکە و چاوەڕێی چاو تروکاندی من دەکەیت، کە من چاوم تروکاند یان چاوم داگرت مانای وایە من ئەو پیتەم دەوێت و تۆش لەو پیتەدا دەوەستیت. ئەم ڕاهێنانە بەردەوام دەبێت هەتا دەبیتە خاوەنی وشەیەکی ڕێکوپێک و تەواو، دوای ئەوەش بە چەند وشەیەک ڕستەیەکی ڕاست و ڕوون و ڕەوانت بۆ دەردەچێت. جا من بە شێوەیەکی تیۆری و بیردۆزی باسمکرد. بەڵام لە ڕاستیدا کێشە دروست دەبێت بۆ هەندێ لە سەردانیکەرانم. لەبەر حاڵەتی شڵەژان و بێئارامی و گەلحۆیی، جیاوازی و کێشە دروست دەبێت لە نووسینەوەی کۆدەکانی مندا.

هاندەرانی یاری سکڕابڵ و کرۆس وۆرد(١) زۆر باشن لەم ڕاهێنانەدا. کچانیش لە کوڕان باشترن. بە دەسگیرۆیی ڕاهێنانێکی بەهێز و پێز هەندێ کەس کۆدەکان بە دڵ دەزانن، وە تەماشای ئەو

تیانووســە نــاکەن کە شـێوازی ڕیزبــوونی ئەلفــوبێیەکە و گشـت وشەکانمی تێدایە لە وەکو سینەما ڕۆمانیە کۆنەکان.

حەزدەکەم بـزانم گەر دوای ٣٠٠٠ سـاڵی دیـکە شوێنەوارناسـەکان بەچانسـیش بێـت لاپەڕەیەکـی ئەم تیانووسـە ببیـنن دەگەن بە چ ئەنجامێـک؟ وە بڕیـاری چـی دەدەن لەبـارەیەوە. تیانووسێک کە کوێرانە و بە تێکەڵ و پێکەڵی تێیدا نوسراوە " پزیشکەکە دوو گیانە" ، "بەزۆری بەپێوە"، "ئارپەر ڕیمباود،" وە " تیمی فەرەنسا زۆر باش یاریـانکرد "، وە ئەم ڕستەیانەش هەیـانە وەکـو وڕێنەیەکـی نادیـار و هەیانە ڕێنوسەکەی هەڵەیە و پیتی تێدا پەڕیوە و هەشیانە بڕگەیەک بەتەواوی دیارنییە.

سـەردانیکەرە شـڵەژاوەکان زۆر هەڵـپە دێـن بـۆ ئەوەی تازێبـاری و هاوخەمی و پەژارەی خۆیانم نیشانبدەن. بەبێ هیچ ئاوازێک بەسەر ئەلفوبێیەکەدا دەڕۆن و لەخۆوە وشە دروست دەکەن، پاشان کە دەبینن شتێکی هەڵەیان بۆ دەرچووە و لە ئەنجامەکەی تێناگەن، دەموچاویان یەک بەخۆی هاواردەکات و دەڵێت "من گێژم!". بەڵام لە کۆتاییدا شڵەژاویەکەیان هەلێکم دەداتێ بۆ ئەوەی ئیسراحەتێک بکەم، لەبەر ئەوەی ئەوان دەسـتیان بەسـەر گفتوگـۆکەدا گرتـووە، پرسـیارکەر و وەڵامدەرەوەیش هەر خۆیانن. کاری من تەنها لە کۆتایی قسەکاندایە. مـامەڵەکردن لەگەڵ کەسـە کەمـدوو و وسـکتەکاندا زۆر قـورس و وەڕسکەرە، ئەگەر من لێیان بپرسم " چۆنیت باشیت؟ " ئەو یەکسـەر دەڵێت " باشم " و تۆپەکە هەڵدەداتەوە ناو یاریگایەکەی مـن. لەگەڵ هەندێکدا ئەلفوبێم لێدەبێت بە بەربەستی تۆپهاویشتن، دەبێت بەم هەموو

ناڕەحەتیەی خۆمەوە من پرسیاری لێ بکەم! خۆ ئەگەر من ئەو کارە نەکەم بە بێدەنگی زەق زەق تەماشام دەکات. بۆیە دەبێت پێشتر دوو سێ پرسیارێک ئامادە بکەم هەتا دوایی تووشی بارگرانی نەبم. کەسە وردبینەکان هەرگیز ناکەونە هەڵەوە: دوودڵانە هەموو پیتێک دەنووسنەوە و هەتا ڕستەکەش تەواو نەبێت خۆیان ماناکەی لێکنادەنەوە، پەلەی قسەکردن و پیشاندانی خەفەتباری خۆیانیان نییە، وە هەرگیز خەون بە تەواوکردنی وشەیەکیشەوە نابینن. نایانەوێت بە هیچ شێوەیەک هەل بە هەڵە بدەن تا جڵەوگیری بارودۆخەکە بکات. کە من دەڵێم"قار"، ئەوان هەرگیز بۆم تەواو ناکەن و بڵێن "چک"، یان من بڵێم "ئەتۆم" ئەوانیش "ی"یەکەی بۆ زیاد بکەن. وە هەروەها بڵێم "بێ" و ئەوانیش بڵێن "کۆتا"، یان بڵێم " نالە" و ئەوانیش بڵێن "بار". ئەم جۆرە لە دوودڵی تووشی بەرەوپێشچوونێکی تاقەتپڕووکێنم دەکات. بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە دەتوانی خۆت لە بەهەڵەتێگەشتنی ئەو کەسە هەڵەشانە بەدوور بگریت کە ئەو شتەی لە مێشکی تۆدایە فەرامۆشی دەکەن و پێداگرن لەسەر هەڵەکانی خۆیان. ئەو کاتە لە کەین و بەینی ئەم یاریە ژیریە تێگەشتم کە داوای " Lunettes" چاویلکەکانم کرد، بەڵام ئەوان بە "Lune"(٢) تێگەشتن و ووتیان بەم حاڵەوە تۆ مانگت بۆ چییە؟!

## شابانوو

هەندێ شوێنی فەڕەنسا کە هێشتا ملکەچی و ڕێزی خۆیان پیشانی شاژن یوژنی(٣) دەدەن، بەڵام زۆر کەمن. هۆڵە دەنگدەرەوە گەورەکەی نەخۆشخانەی ناڤاڵ ئەوەندە گەورە و فراوانە کە بە یەک جار پێنج کورسی و جێخەوی پێچکدار دەتوانن پێیدا تێپەڕببن. لە پەنجەرە پەڵە پەڵەیاویەکەشەوە وێنە و نیگاری هاوسەری ناپلیۆنی سێیەم - کە دەکاتە خاوەنی نەخۆشخانەکە - لێوە دیارە. ئەم مۆزەخانە خنجیلانەیە دوو شتی زۆر ناوازەی هەیە، ئەوانیش بریتین لە پەیکەرە سپیەکەی هاوسەرەکەی ناپلیۆن، کە سەر و سینگ و بەرۆکی دیارە و هێمای شکۆ و خانەدانیەتی تەمەنی گەنجێتیەتی لێدەتکێت. ئەوی تریشیان ئەو نامەیەیە کە جێگری بەڕێوبەری وێستگەی شەمەندەفەری بێرک تێیدا وەسفی سەردانە کورتە شاهانەییەکەی لە بەرواری ٤،٥،١٨٦٤ بۆ سەرنووسەری کۆرێسپۆندێنیت ماریتایم دەکات. لە وەسفکردنەکانیەوە شەمەندەفەرێکمان دێتە پێشچاو کە تیپێکی نواندنی دەست و پێوەندی شاژنە یوژنی تێدایە لەگەڵ کاروانە دڵخۆش و ئاسوودەکانی نێو شارەک، وە کاری ئەوانیش بریتیە لە پێناساندنی دایەنە خەمخۆر و بەناوباگەکانی نەخۆشخانەکە بۆ نەخۆشە بچووکەکان. بۆ ماوەیەک لەدوو هەموو دەرفەتێک بووم بۆ ئەوەی ڕێزی خۆم پیشانی ئەم شوێنەوار و پاشماوانە بدەم.

چەند جارێک هەژماری پیاوی شەمەندەفەرەکەم خوێندەوە. تووشم دەبوو بە تووشی پۆلێک ئافرەتی چەنەباز کە لە دەوروخولی شاژنە یوژنی بوون، هەرکاتێک شابانووە یوژنی لە قاوشێکەوە بە قردێلە زەرد و چەترە ئاوریشمیە ئافرەتانەکەیەوە دەچووە قاوشێکی دی، منیش لەو ڕێگەیەی کە بۆنی عەترەکەی ئەوی لێدەهات، عەترێک تێکەڵ بە کۆڵۆنی، دوای دەکەوتم و لەدووی دەڕۆشتم. ڕۆژێک کە سووکە بایەکی هەبوو، هەموو غیرەتی خۆم کۆکردەوە و ڕۆشتمە پێشەوە و دەمووچاوم لە پێچەکانی عەزیەکەیدا - کە دەزووی ئاوریشمی ساف و لووسی پێوە بوو - نوقم کرد. شیرین بوو وەک کرێمی سەر کێکان و، فێنک بوو وەک شەونمی بەرەبەیان. خێرداربێت ئەویش خۆی لێ دوورنەخستمەوە، بەڵکو پەنجەکانی بە ئەسپایی بە قژمدا هێنا و بە چرپە گووتی، " ئەها، ئەوە تۆیت، ئەوەتانێ جگەرگۆشەکەم، دەبێت زۆر ناساغ بیت"، بە شێوەزارێکی ئیسپانی ووتی کە لە لەهجەی پزیشکە دەمارزانەکەوە نزیکبوو. ئیدی ئەو وەکو شابانووی فەرەنسا نەبوو، بەڵکو شێوەی قەشە ڕیتا - شاژنی هۆکارە بزربووەکان- دایکێکی میهرەبان و سۆزیار بوو.

دوانیوەڕۆیەک کاتێک کە هەموو خەم و ناسۆرەکانی خۆمم بۆ هەڵدەڕشت، دەموچاوێکی نەناسراو و بیانی خۆیکرد بە نێوانماندا. لە ئاوێنەیەکەوە ڕەنگدانەوەی وێنەی پیاوێکم دیت کە وەکو ئەوە وابوو تێزاب بە دەموو و چاویدا کرابێت. دەمی وەک ئەوەی بادرابێت لاربووبوو، لوتی شێوەیەکی شێواوی هەبوو، قژی بژ و دەمی بەشێوەکەی تۆقێنەر کرابوویەوە. چاوێکی بە دەزوو دوورابوویەوە و چاوەکەی دیش وەکو چاوی قابیل دەرپۆقیبوو. دوای ماوەیەک لە

سـەیرکردنی بیلبـیلە کشـاوەکانی بـۆم دەرکەوت کە دەمووچـاوی خۆمە.

کە ئەوانەم دیـت لەخـۆوە و یەکڕاسـت تووشـی ئاسـوودەیی و بەختیاریەکی نامۆ بووم. جا بەختیاریەکەم تەنها هی ئەوە نەبوو کە مـن لە خەڵکـی دوورخرابـوومەوە، ئیفلیجبووبـووم یـان بـێ زوبـان و نیوەکەڕ، لە هەموو خۆشی و چەژەکانی ژیان بێبەش کرابووم و ژیانم شێوەی ژیانی ماسییەک بوو، بەڵکو هی ئەوەش بوو کە دەموچاوم هێنـدە تێکچووبـوو قێزت نەدەهـات تەماشـام بکەیـت. هەنـدێ جـار بەدبەختـی و بێچارەییەکـانی ژیـان تووشـی پێکەنینێکـی خەماویـت دەکەن کە لە دەستی خۆتـدا نییە- کاتێک کە چارەنووس دوایـین کارتی بێبەزەییانەی خۆی لەگەڵماندا بەکاردەهێنێت، ئێمەش ئیدی شتەکە بە فشە و نووکتەیەک وەردەگرین. یەکەم جاریش کە یوژنی پێکەنیـنە ناسـازەکەمی ژنەفـت بەلایەوە گەلـێ نـاخۆش بـوو، بەس دوایی پێی ڕاهات و بەیەکەوە دەمانـدا لە قاقای پێکەنین و پێکەوەش دەمانـدا پـڕمەی گریـان. دەسـتوپێوەندی شـارەوانیش دەسـتیانکرد بە شاییکردن، منیش دڵـم زۆر خۆش بـوو لەبەر ئەوەی بە ویستی خۆم هەستابوومەوە ئیتر لە خۆشیاندا یوژێنیم داوەتکرد بۆ سەمایەک. دەمانتوانی پێکەوە چەندین میـل سەمامان بکردایە. لەو کاتەوە کە بەناو هۆڵە گەورەکەدا تێدەپەڕم، یەکسەر بۆ سەرەداوێک دەگەڕێم کە دڵخۆشیم لە زەردەخەنەکانی شاژندا نیشان بدات.

## مینێسیتا

لەبەر ئەو فڕۆکە دەنگبەرزانەی کە بەبەرزی سێ سەد پێ بەسەرو نەخۆشخانەی ناڤاڵ و بەلای کەناراوەکانی بێرکدا دەفڕن، نەخۆشخانەکە بووەتە خاوەنی دیمەنێکی هەناسەبڕ و دڵڕفێن. بەهۆی ئەو سێبەرە درێژ و زەبەلاحە و ئەو دیوارە خشتییە بەرزەی کە ڕووی کردووەتە باکووری فەڕەنسا، وەکو ئەوە وایە کە لە نێوان لمەکانی دەوروبەری شار و ئاوە خۆڵەمێشیەکەی نێو جۆگەکەدا چەقیبێت. لە ڕووکاری دەرەوەی بیناکەشدا – کە شکۆداری و ڕەونەقی پێوە دیارە- هەر وەکو لەسەر قوتابخانە و گەرماوەکانی پایتەختی فەڕەنسادا نووسراوە "شاری پاریس". ئەم نەخۆشخانەیە لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی دووەمی فەڕەنسیدا دروستکرا بۆ ئەو منداڵانەی کە پێویستیان بە ژینگەیەکی تەندروستر لە ژینگەی نەخۆشخانەکانی دیکەی فەڕەنسا بوو. ئەم نەخۆشخانە بۆ ئەو منداڵانە بنیادنرا کە ئاتاجیان بە نەخۆشخایەک بوو کە بە مانای وشە نەخۆشخانە بێت.

بۆ ماوەیەک ئەم ڕاستییە تاڵە لە هەرێمی پاس دێ کالایس دەمانهێڵێتەوە، بەڵام هەتا ئەم ڕژێمە پزیشکیە بیۆکراسیە مابێت، هەر لە ڕۆخی ڕووبارەکانی سێینێ دەبین.

بەم هەموو هۆڵە تێکئالاوەیەوە نەخۆشخانەکە زیاتر لە تۆڕە ڕێیەک دەچێت. یەکێکیش لەو ڕێگایانە لە مێناردەوە دەڕواتەوە سەر نەخۆشە بێدەرەتانەکانی سۆرێل – کە لەدوای برینکارە خۆفیداکارەکانەوە

نـــاونراوە. هەر وەکـــو ئەو منـــداڵانەی کە لە دەســـتی دایکیـــان ڕایانکردبێت و چەندین نەهامەتی و کۆڵەواریان دیتبێت، ئەم کزۆڵ و بێچارانەش کە بە هاوکاری دارشەقەکانیان بەپێوە دەوەستن، بە ئەستەم لەژێر لێوەوە دەڵێن "مـن ون بـووم." ژیـانم لە سۆرێلدا وەکـو ئەوە وایە لەماڵی خۆمـدا بم، بەڵام نـاتوانم هەمـان بڕیـار بدەم لەسـەر نەخۆشـە نوێیەکان. دەمتوانی هەر کاتێک کە کورسیە پێچکدارەکەمیان بە ئاڕاسـتەیەکی هەڵەدا بـرد بە چـاوم ئاماژەیـان بـۆ بـکەم و تێیـان بگەیەنم، بەڵام مـن وەکـو ئەو بەردەی لە شـوێنی خۆیـدا ڕەق بوویێت چـاوم نەدەجولاّنـد. هەمیشـە هەلێـک هەیە بـۆ ئەوەی لە سـوچێکی نەناسراوی ئەم نەخۆشخانەیەوە دەموچاوێکی نوێی نەخۆشێک و بۆن و بەرامەیەکی نوێی خواردنەکان بەسەرماندا بێت و بەشتێکی دڵخواز ئاشـنا ببـین. هەر بەم شـێوەیەبوو کە منـیش ڕێـم کەوتە ڕێـی ئەو باڵەخانە گەورەیەی کە گلۆپێکی گەورەی بەسـەرەوە بـوو. ئەو کـاتە بـوو کە دوای زنجیرەیەک بوورانەوەی قـووڵ و لە یەکەم گەشتم بە کورسـیە پێچکدارەکەمـدا دیـتم. ئەو کـاتە بـوو کە بە بەرزکەرەوەکە لەسـەر نهـۆمێکی هەڵە دابەزتـین، بینـیم کە چەنـدێک بەرز و بەهێز بوو، چەندێک دڵنیایی پێدەبەخشیت، شێوازی ڕەنگکـردنەکەی جلی رەگبیەکەمـی بیردەهێنـامەوە کە تـاڵێکی سپی و تـاڵێکی سـووربوو. منیش یەکسەر خۆم خستە ژێر ئەو سیمبولە برایەتی و فیداکارییەی، کە زیـــاتر لەوەی بوویێـــت بە پـــارێزەی گەشـــتیوانەکان، بوویـــوو بە پـــارێزەری ئەو نەخۆشـــانەی کە وەکـــو کەشـــتیەکی بـــارکەوتوو لە ڕۆخەکـانی تەنیایـدا کەناریـان گرتـووە. مـن و باڵەخـانە گەورەکە پەیوەنـدیمان بەردەوامبـوو، هەنـدێ جـاریش ئەو باڵەخـانەیەم وەکـو

نێوانگیرێکی خۆم و سینێسیتا دەهاتە پێشچاو. سینێسیتا ئەو هەرێمە یان ئەو شوێنە بوو کە خولم بەدەوریدا لێدەدا و وەکو بناغەیەکی خەیاڵەکانم بوو بۆ نەخۆشخانەکە. سینێسیتا ئەو هەیوانە جاویدانیە جێهێڵدراوەی قاوشی سۆرێلە. بە باڵکۆنە فراوانەکانیەوە لە باشوورەوە بەسەر ئەو دیمەنێکی شاعیرانە و دڵڕفێنەی کە لە فیلمەکاندا هەیە، دەڕوانێت. قەراغی شاری بێرکیش شێوەی لە ڕێڕەوێکی ئاسنینی شەمەندەفە دەچێت. دەستەبژێرێک لە باڵەخانەکانی گردە لمینەکان وەهمی بیرکردنەوە لە خێوە ڕۆژئاواییەکانی لە مێشکتدا دەبزواند. لەبارەی دەریاکەشەوە، ئەوەندە کەف دەکات کە دەڵێی بەکامێرایەک دەستکاری کراوە هەتا ئەو هەموو شەوق و پرشنگداریە بەخشبکاتەوە.

دەمتوانی هەموو ڕۆژەکە لە سینێسیتا بەسەر ببەم. لەوێ من گەورەترین دەرهێنەری مێژووبووم. تەواوی دیمەنەکانی شاکارەفیلمی "تەچ تۆف ئیڤڵ" م دووبارە وێنا کردەوە. لە کەناردەریاکەی خوارەوەش، دیسانەوە لاسایی جووڵەکانی بووکەڵەکەی ستەیج کۆوچ دەکەم، وە لەناو دەریاکەشدا ئەو زریانە لەرزێنە بۆ قاچاخچیانی موونفلیت دروست دەکەم. لەناو دیمەنی سروشتی ئەودیو پەنجەرەکەدا دەتوێمەوە و ڕۆدەچم، جگە لە دەستلێدانە هاوڕیانەکەیان لە پەنجە سڕبووەکانم، هیچ پەیوەندیەکی دیکەم نییە لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا. من ئێستا پاڵەوانی گۆداردم لە پییەرۆت لێ فۆو دا، دەموچاوم بە ڕەنگێکی شین سواغدراوە و حەڵقەیەکیش لە تەقەمەنی وەکو تاجەگوڵینەیەک لە دەوری سەرم پێچراوە. جار جار بە مێشکمدا دێت تەقەمەنیەک دابگرسێنم گڕی تێبەردەم، بەڵام ئەم

خەیاڵەشم وەکو هەورێکی بەر زریان و با ون دەبێت و لەبەر چاوان ئاسەواری نامێنێت. دوای ئەوەش ئێوارە دێت و زەردەپەڕ دەردەکەوێت و ئیدی کاتی ئەوەیە منیش بگەڕێمەوە ژوورەکەم. چاوەڕوانی هاتنی زستانم، دەمەوێت جلێکی باش بکەمە بەرم تا گەرموگوڕ دابێم، دەشتوانین هەتا درەنگانێکی شەو بە دڕندۆکی دابنیشین و تەماشای هەڵهاتنی خۆر بکەین. دەشێت ببینین کە چۆن باڵەخانە بەرزەکەی بەرامبەرمان گڵۆپەکەی دادەگرسێنێت، وە لە ڕوناکیە پڕهیوایەکانی ئاسۆ ڕابمێنین.

# گەشتیارەکان

دوای ئەوەی بێرک لێبڕاوانە خۆی تەرخان کردبوو بۆ ئەو منداڵانەی کە لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە تووشی نەخۆشی سیل بووبوون، بەرە بەرە فیداکاری و دەستیاریەکەی بۆ منداڵان ڕووی لە کەمی کرد. لەمڕۆدا بێریک زیاتر یارمەتی کەسە بەساڵاچووەکان دەدات، دەستیاری ئەو کەسانە کە دووچاری تێکشکانێک و پووکانەوەیەکی لاشەیی و مێشکی بوون. ئەگەر دەتانەوێت بزانن جەوی نەخۆشخانەکە چۆنە، ئەگەر دەتانەوێت بزانن دانیشتوانەکەی لە چ جۆرە مرۆڤێک پێکهاتووە، ئەوا پێشنیار دەکەم تەماشای وێنەیەک بکەن کە لەتاو بەتەمەنەکان کەسی دیکە لە وێنەکەدا جێگەی نەبێتەوە. لە بەشێکی نەخۆشخانەکەدا ئەو نەخۆشخانەی لێن کە بۆ ماوەیەکی زۆرە لەناو بێهۆشیدان، غەرقی نێو شەوێکی نەبڕاوە و هەمیشە لەبەردەم دەرگای مردندان. ئەوان هەرگیز ژوورەکانیان بەجێناهێڵن. هەموو کەس دەزانێت لەوێن و بۆ ئێمە لەشێوەی نامۆیەکدا دەردەکەون، نامۆیەک کە لەڕووی ویژدانەوە هەست بە تاوانباری بکەین بۆ ئەو حاڵەی تێیدان. لە بەشێکی دیکەی نەخۆشخانەکەدا کەسانێکی بەساڵاچوو و بیماری زیاد لە سنوور قەڵەویان تێدایە، هێندە زۆرن تەنانەت پزیشکەکانیش حەزدەکەن نەمێنن یان بەلایەنی کەمەوە قاتوقڕیان تێبکەوێت. شوێنەکانی دیش پڕیەتی لە هۆردووی کەسانێک کە دووچاری ئیفلیجی بوون. ئەوانیش وەکو من لە کارەساتێکی ئۆتۆمۆبێل، وەرزشی، یان هەر

ڕووداوێکی تر کە دەکرێت بەسەر مرۆڤێکدا بێت لە نەخۆشخانەی بێرک دا دەمێننەوە هەتا رۆژێک دەست و قاچەکانیان دەکەوێتەوە کار.

بۆ ئەوەی وێنەی نەخۆشخانەکەتان بەتەواوتی لە پێشچاوو ڕوون بکەمەوە، دەبێت سەرگوزشتەیەکی ژینگەکەی خۆمتان بۆ بەیان بکەم. ژینگەیەی نەخۆشەکان وەکو ئەو شوێنەیە کە پڕیەتی لە باڵندەی باڵ شکاو و بولبولی لاڵ و قاژووی بەدەر لەم دونیایە. ئێمەش وەکو باڵندەکان بێچارەین، باڵندەیەکین کە شوێنی خۆمان لە هۆڵە گەورەکەی بەشی نەخۆشییە دەماریەکاندا کردووەتەوە. زۆر دڵنیام کە ئێمە ئەم دیمەنە جوانەمان تێکداوە. ئاگام لە هەمووئەو ناڕەحەتیانەیە کە بۆ کەسانی دیکە دروستی دەکەین. بێدەنگ و ڕەق و تەقین، بەڵام من و ئەوانەی لەم نەخۆشیەی منیان هەیە کەمێک لەوانەی دی بەبەخترین.

ژووری ڕاهێنان باشترین شوێنە بۆ ئەوەی لە حاڵەتەکە تێبگەن، هەموو ئەو نەخۆشانەی کە ئاتاجی چارەسەرێکی فیزیاین لێرە کۆکراونەتەوە. ژوورێکی قەرەباڵغ و پڕئامێر، هەراوزەنایەک لە دارشەق و دەست و قاچە دەستکردەکان، وە پڕ لە هەموو داو و پەتێکی هەمەجۆر. ئەم شوێنە ڕێک وێنەیەکی لەیەکچووی کۆرت ئۆف میراکلسە. لێرە گەنجێکی گوارە لە گوێ دەبینرێت کە لە ڕووداوێکی مۆتۆڕسکیدا تووشی چەندین شکان هاتووە، پیرەژنێک لە جلە خەوە زەق و باق و بریقەکەیدا هەوڵدەدات بۆ ئەوەی دووبارە فێری ڕۆشتن ببێتەوە دوای ئەوەی لە پەیژە کەوتووەتە خوارەوە.

سەرخۆشێک کە پێی بووە بەژێر قیتارەوە و لەگەڵیدا قاچیشی لەدەست داوە. ئەم هەموو قەرەباڵغی و ئاپۆڕەیەی کە دەست و قاچەکان دەستکردەکان دروستیان کردووە، وەکو ئەوە وایە ڕیزبووبن و لە سەرەی شتێکدا وەستابن. زیاتر لە ڕیزێک پیاز دەچن. لە هەمانکاتدا منیش بە سیسەمێکەوە بەستراومەتەوە و تۆزێک بۆم بەرزکراوەتەوە هەتا ئەم شتانە ببینم. هەموو بەیانیەک نیو کاتژمێر ئەمە کاری منە، دەبێت ئاوە ڕەق و ڕەپ بوەستم، وەکو ئەوەی لە سەرمانا بەستبێتم. دواتر دەبێت چاوەڕوان بم تا پەیکەری ستایشکاری دووەم شانۆگەری دۆن جیۆڤانی مۆزارت بووروژێت و لەخەو ڕابێت. لە خوارەوە خەڵکی قاقا لێدەدەن و قسەی خۆش و گاڵتە دەکەن و بەهەر جۆرێک بیانەوێت بانگی یەکدی دەکەن. حەز دەکەم منیش بەشداری لەم گاڵتە و گەپ و قەشمەریاتەدا بکەم، بەڵام دوای ئەوەی ئاڕاستەی چاوم لەسەر کەسە گەنجەکە و پیرەژنەکە و سەرخۆشەکە لابرد، هەست دەکەم ئیدی پێویستە دەست بکەمەوە بە تەماشاکردنی ئەو پشکنەری دووکەڵەی کە بە سەقفەکەوە بەستراوە. دەبێت "گەشتیارەکان" زۆر لە ئاگر بترسن.

## سۆسەج

دوای ئەوەی کــاتی خــۆم لەســەر سیســەمەکە تەواودەکەم، بە قەرەوێڵەیەکی دیکەی پێچکدار لە ژووری ڕاهێنانەکەوە دەمبەن و لەپاڵ جێگە خەوەکەمدا دامدەنێن. لەوێدا چاوەڕێی یارمەتی و دەستگیرۆیی پەرستارەکان دەکەم بۆ ئەوەی بمخەنەوە شوێنی خۆم. هەموو ڕۆژێک لە کاتی نیوەڕواندا کورسیە پێچکدارەکە بە لاقرتێ و دەموچاوێکی گەشەوە پێم دەڵێت "نۆشی گیانت بێت". ئیتر بەم جۆرە ماڵئاوایم لێدەکات و هیوای بینینەوەم دەخوازێت. هەر بەڕاستی ئەگەر یەکێک لەم حاڵەی مندا بێت و پێی بووترێت نۆشی گیانت بێت وەکو ئەوە وایە نیوەڕۆدا پێی بڵێیت شەو شاد، یان لە ١٥ی مانگی ئۆگەستدا بڵێیت سەری ساڵت پیرۆز بێت. لەم هەشت مانگەی دوایدا پتر لە چەن دڵۆپەیەکی ئاولیمۆ و نیو کەوچک ماست هیچ شتێکی دیکەم تام نەکردووە. هەر بەڕاست کاتێک بە گەروومدا دەڕۆشتە خوارەوە یەک دەنگەدەنگێکی دروستدەکرد هەر مەپرسە، دەیکرد بە ڕۆژی خۆی. ئەو تاقیکردنەوە و بەرنامەیەی بۆ خواردنی منیان دانابوو سەرکەوتوو نەبوو و ئەنجامێکی ئەوتۆی نەدا بەدەستەوە. بەڵام سەرنەکەوتنەکەش ئەوەندە جێگەی ترس نییە چونکە تا ئێستا لە برسان نەمردووم. لەڕێگەی بۆڕیچکەیەکەوە چەند شلەیەکی قاوەیی دەکەنە نێو لەشمەوە، ئەو شلەیەش کالۆری ڕۆژانەم دابین دەکات. بۆ ئەوەی کەمەکێک ڕۆحم بەبەربێتەوە و خۆشی

ببینم، بیر لەو خۆشی و تام و بۆیانە دەکەمەوە لە کە ڕابردوودا وەکو ئەوەی لە دۆڵێکی خۆشیدا بوویێتم، بینیومن.

جاران زۆر لێهاتوو و بەتوانابووم لە بەکارهێنانەوەی پاشماوەکاندا. ئێستاش کارم ئەوەیە یادگارییە کۆنەکانم وەکو چێشتێکی ساردبووەوە دووبارە گەرم بکەمەوە. بیردەکەمەوە پێشتر دەمتوانی هەرکاتێک بمویستایە بێ هیچ ڕێگر و ڕێوڕەسمێک دابنیشم و شیوی خۆم بخۆم. ئەگەر لە ڕێستۆرانتێک بوومایە ئەوە خۆهیلاکردنیشی نەدەویست و شتەکە بە ئامادەکراوی دەهاتە بەردەستم. من چێشتلێنەرێکی زۆر باش و بەتوانام، گەر من شێفەکە بم ئەوە بەدڵنیاییەوە خواردنەکە ناوازە دەردەچێت. لە خواردنەکاندا بیێف بۆگوینۆن تامێکی خۆش هەیە و لەسەر گەدەش سووکە. بیێف ئێن گێلێش بە ڕەنگە جوانەکەی بۆلای خۆیت ڕادەکێشیت و مرەبای قەیسیش هەمیشە وەکو کێک شیرینە. بەپێی کەیف و جەوی خۆمە، هەرکاتێک حەزم لێبێت شتێک دەخۆم، جاری وایە دەرزەنێک لە هێلکە شەیتانۆکە دەخۆم، جاری واش هەیە قاپێک سۆسەجی فەڕەنسی لەگەڵ ترشیاتی کەلەرم و بتلێک گیوورزترامینێر دەخۆمەوە، یان هێلکەیەکی کوڵاو و پەتاتەی سوورکراوە و کەرەیەکی کەم خوێ دەخۆم. چ خوانێکە! زەردێنەی هێلکەکە دەم و مەلاشوم گەرم دەکاتەوە و بە قوڕگمدا دەچێتە خوارەوە، هەموو کاتێکش شتەکانم بە ئاسانی بۆ هەرس دەکرێت. هەموو جارێک نوێترین و سروشتیترین شتەکان بەکاردەهێنم، وەکو؛ نوێترین سەوزەوات، ماسیەک تازە گیرابێت یان گۆشتێک کە بە ناسکترین شێوە مامەڵەی لەگەڵدا کرابێت. هەمووی شتێک دەبێت بەڕێگای

شیاوی خۆی ئەنجام بدرێت. هەر بۆ ێ دڵنیایی خۆم هاوڕێیەکم ڕەچەتەی دروستکردنی باشترین سۆسەجی بۆناردم - ئەندۆولیتێ دێ ترۆییس- لەگەڵ سێ جۆری گۆشتدا کە لە شێوەی کەزییەکدا ئامادەکرابوون. هەروەها بە جوانی دیقەت دەدەمە ئەو ڕیتمەی کە وەرزەکان لەسەری دەڕۆن. لە ئێستادا زمانم بە کاڵەک و میوەی سووربراو تەڕدەکەم. وازم لە گوێچکەماسیش هێناوە هەتا پایز دێت- نازانم ئایا دەبێت بیخۆم یان نا، چونکە ئێستا زۆر وریای خۆمم، ڕێک وەکو ئەو سۆفیەی کە خۆی لە خواردن گرتووەتەوە. لەبەر ئەو بەدخۆراکیەی تێیدام، نەوس و برسێتی ناچارم دەکەن بچم و لە چێشتخانە خەیاڵییەکەمدا خواردنێک بخۆم. نەوسن و زۆرخۆر بووم، بەڵام ئەمڕۆ بە سۆسجێکی کۆنی فەقیرانەش ڕازیم. یان هیچ نەبێت کلۆیەک لە لیۆنس ڕۆسێت، وشک بێت و بەجوانی لەتلەت کرابێت. هەر لەتێک دەکەیتە دەمتەوە پێش ئەوەی دەستبکەیت بە جوینی خۆی لە دەمتدا دەتوێتەوە و تام و چێژەکەی دەڕواتە نێو کونیلەکانی زمانت. مێژووی ئالوودەبوونم بەم سۆسەجەوە دەگەڕێتەوە بۆ چل ساڵ بەر لە ئێستا. هەرچەندە لەگەڵ تەمەنیشمدا یەکناگرێتەوە بەڵام تا ئێستاش حەزم لە نوقڵە، وە زیاتر لە نوقڵیش ئارەزووی گۆشتی ئامادەکراو دەکەم.

پەرستارەکەی باپیرم هەمیشە هەستی بەو عەشقە ئەبەدیەی منی بۆ سۆسەج دەکرد کاتێک. دەچووم بۆ ئەپارتمانە کۆن و ڕزیوەکەیان لە بۆولیڤارد ڕاسپەیڵ و لێی دەپاڕامەوە تا سۆسەجێکم بداتێ. ئەو ئافرەتە زۆر شارەزا و لێزانبوو لە قایلکردنی منداڵ و گەورەکانیشدا، بۆیە لە کۆتاییدا سۆسەجێکی دا بە من و لەگەڵ باپیریشمدا

هاوسەرگیری کرد پێش ئەوەی بمرێت. ئەو دیاریانە هێندەی ئەو ناخۆشیانەی نێو پرۆسەی هاوسەرگیری دایک و باوکم بۆ من خۆش بوو. هەندێک جار زۆر بە ئەستەم باپیرمم بیر دێتەوە؛ پیاوێک لەسەر قەرەوێڵەیەک ڕاکشابوو و دەموچاوێکی مرومۆچ و پڕ لە پەژارەی هەبوو، وەکو ئەو وێنەی ڤیکتۆر هۆگو وابوو کە لەسەر دراوی پێنسەد فراکیە. بەڵام هەندێجاری دیکە زۆر بەباشی باپیرمم بیردێتەوە، کە هەر وەکو سۆسەجێکی هەڵقرچاوی ناو ڕۆن بە نارێکی لەسەر قەرەوێڵەکەی پاڵکەوتبوو. بۆخۆی بەهێمنی ڕاکشابوو لەنێوان یارییە منداڵانەکان و دەفتەروێنەکاندا.

# فریشتەی پارێزەر

لەسەر باجی کراسە سپییەکەی ساندرینێ نوسراوە "پزیشکی ئاخاوتن"، بەڵام لەڕاستیدا دەبوایە لێی بنوسرایە "فریشتەی پارێزەر".
ساندرینێ ئەو خانمەیە کە کۆدگەلێکی بۆ دانام تا بتوانم پەیوەندی بە جیهانی دەرەوە بکەم، بێ ئەو من نەمدەتوانی بەهیچ جۆرێک قسە لەگەڵ کەسانی تردا بکەم. بەس دەستی شکاوم، لەکاتێکدا زۆربەی هاوڕێکانم ئەو کۆدگەلە دەزانن بەڵام تەنها ساندرینێ و خانمە دەرونزانەکەی تر لێزانانە بەکاریدەهێنن. زۆربەی کات نەمدەتوانی بەشێوەیەکی تەواو و ڕێکوپێک چاو بقوچێنم یان سەرم تۆزێک دانەوێنم بۆ ئەوەی کەسانی دی دەرگاکەم بۆ دابخەن، بەلوعەکە بکەنەوە، یان دەنگی تەلەڤیزیۆنەکە کەم بکەنەوە و پشتیەکەم بۆ خڕ بکەنەوە بۆ ئەوەی بە ئاسوودەیی سەری لەسەر دابنێم. نەمدەتوانی، بۆیە زۆرجار سەرکەوتوو نەبووم. دوای تێپەڕینی چەند هەفتەیەک ئەم تەنیاییە ناچاری کردم فێری ئارامگرتن ببم، وەهەروەها تێبگەم کە کەسانی نێو نەخۆشخانەکە دەبن بە دوو بەشەوە: جۆری یەکەمیان کە زۆرینەن، ئەوانەن کە ژوورەکە بەجێناهێڵن هەتا نەزانن منێکی داماو و بێدەرەتان داوای چی دەکەم، جۆری دووەمیش کە کەمینەن، کەسانێک تا ڕادەیەک بێویژدان و ناهۆشیارن، لەژوورەکە دەچنە دەرەوە بێ ئەوەی تەماشایەکی من بکەن، وەک بڵێیت ئەو ئاماژە پڕ ناسۆر و بێچارەییانەی منیان نەبینیبێت. وەکو ئەو شێتە بێبەزەییەی کە تەلەڤیزۆنەکەمی کوژاندەوە لە نیوەی یاری نێوان بۆردۆ-میونخ دا

و بەشێوەیەک ووتی "شەو شاد" کە هیچ دەرفەتێکی بۆ من نەهێشتەوە بۆ ئەوەی گومانی خراپی پێ ببەم یان تاوانباری بکەم، بەڵکو لەجیاتی ئەو خۆم بە خاوەنسوچ دەزانی. بێجگە لەوەی ناتوانم دەست و قاچەکانم بجوڵێنم، لەکاتی قسەکردندا تابڵێی وەڕسکەر و بێزارکەم. وەڕسیەکەم وام لێدەکات ڕۆژی دووجار کە ساندرینێ تەقە لە دەرگاکەم دەدات و دەموچاوە سمۆراویە بچووکەکەی لە دەلاقەی دەرگاکەوە دێنێتە ژوورەوە، یەکسەر هەرچی بیرکرنەوەیەکی ناخۆش و تاریک هەبێت لە مێشکمدا بچێتە دەرەوە. بەرە بەرە زەنگۆڵە نوقمبووە نادیار و بێبنەکەی ناخم تۆزێک لە ستەمکاریەکەی هاتووەتە خوارەوە و کەمەکێک میهرەبانتر بووە.

پزیشکی ئاخافتن هونەرێکە کە شایستەی ناسین و بەرزڕاگرتنێکی زیاترە. بە خەیاڵتدا نایەت کە زمانت دەبێت چ جوڵەگەلێکی میکانیکی ئەنجام بدات تا هەموو دەنگەکانی نێو زمانێک بهێنێتە گۆ. هەر ئێستا هەموو هەوڵ و تەقەلام بۆ ئەوەیە پیتی (ڵ) بهێنمە سەر زمانم، زۆر بەزەییم بەخۆمدا دێتەوە دەبێت بەناچاری بڵێم کە سەرنوسەرێکی وەکو من ناتوانێت تەنانەت ناوی گۆڤارەکەی خۆی بڵێت! ئەو ڕۆژانەی کە حاڵم باشە، لە نێوان کۆخەکانمدا هەموو وزەی خۆم دەخەمەگەڕ بۆ ئەوەی دەنگێک هەر هیچ نەبێت وڕێنەیەک بهێنمە سەر زمانم. لە ڕۆژی لەدایکبوونمدا ساندرینێ هەوڵی دا بۆ ئەوەی پیتەکانی نێو ئەلفوبێ کەمێک بەجوانی بڵێم، ئەو هەوڵەی بەرز دەنرخێنم، هیچ دیارییەک لەو دیاریەی ساندرینێ بۆ من بەنرختر نەبوو. وەک ئەوە وابوو ئەو بیست و شەش پیتەی ناو ئەلفابێت چووبێتنە ناو ناشوێنەوە و دەرنەیەن، دەنگە گڕ و

نووساوەکەی منیش وەکو ئەوە وابوو من لە وڵاتێک ئەویش لە وڵاتێکی تر بێت، ئەوەندە لەیەک دووربووین. مەشقە تاقتپرۆکێنەکانم وایان لێدەکردم هەست بکەم کە شاخەوانێکم و بۆ یەکەم جار زمانێکم دۆزیوەتەوە. هەندێ جار پەیوەندیە تەلەفۆنیەکان وچانێک دەدەن بە مەشقەکانمان و منیش تەماشای ساندرینێ دەکەم کاتێک لەگەڵ کەسە خۆشەویستەکانیدا قسە دەکات. ئەم هەموو کارەم بۆ ئەوەیە بەشێکی بچووکی لە ژیانی دەرەوەی ئەم نەخۆشخانە وێنا بکەم، ڕێک وەک چۆن هەوڵی گرتنی پەپولەیەک دەدەیت، بە ناسکی، بە ئەسپایی. کچە بچووکەکەم سێلێست، باسی سەرکێشیەکانی خۆیم بۆ دەکات لەگەڵ ئەسپە بچووکەکەیدا. کچەکەم پێنج مانگی دی دەبێت بە نۆ ساڵ. باوکیشم هەردەم لەدەست ئازاری قاچی دەناڵێنێت. وا تەمەنی گەیشتۆتە نەوەد و سێ ساڵ، بە ئازاییەکی نادیدەوە شەڕ لەگەڵ ژیاندا دەکات. ئەم دوو کەسە لە ڕادەبەدەر خۆشمدەوێن، وە هاوکار و پشتیوانمن بۆ ئەوەی لە ژیاندا بمێنمەوە. هەندێ جاریش بیردەکەمەوە داخۆ ئەم ئاخافتنە یەکلایەنەی ئەوان لەگەڵ مندا چ هەستیک لای ئەوان دروست دەکات! کە ئەوان دەبینم ورەم دێتەوە بەرخۆم. داخەکەم زۆرم حەز لێیە وەڵامی ئەم ووتە جوان و خۆشانەی ئەوان بدەمەوە بە شتێک جگە لە بێدەنگیەکەم. دەزانم ئەم بێدەنگیەی من لەسەر هەندێکیان شتێکی زۆر قورسە. فلۆرێنس، هاوسەرە شیرینەکەم، هەموو جارێک قسەی لەگەڵ نەدەکردم هەتا بە دەنگە زبرەکەم هەناسەیەکم نەکردایە بەو دەمامکە ئۆکسجینیەی کە لە دەممدا بوو، دوای ئەوەی هەناسەکەم بەدڵی ئەو دەکێشایە دەرەوە

بە تێکەڵەیەک لە ترس و پەرۆشییەوە دەیووت "جین دۆمینیک، ئاگات لێمە؟"

دوای ئەوەم لەبیر نایەت، نازانم چیم ژنەفت.

## وێنەکە

کۆتاجار کە باوکم بینی ڕیشم و سمێڵم پاک و جوان بۆ تاشی. هەفتەیەک دوای ئەوە ڕووداوەکەم بەسەر هات و نۆبەکە وەکو مۆتەکەیەک لێیدام. لەبەر ئەوەی حاڵی باش نەبوو دەبوایە شەو لە ئەپارتمانە بچووکەکەی نزیک باخچەکانی تویلێریس لەلای بمێنەوە. دوای ئەوەی بەیانیەکەی شیرێکی تێکەڵ بە چام بۆ هێنا، بڕیارمدا لەدەست ئەو کۆڵە ڕیش و سمێڵە ڕزگاری بکەم. ئەو ساتەم باش بەبیردێت، وەکو ئەوەی یادگاریەک بێت و وەکو بزمارێک بەسەرمدا چەقێندرابێت.

بەسەر کورسیە سوورەکەیدا چەمابووەوە و دانیشتبوو کەوکوژی تەماشای ڕۆژنامەکانی دەستی دەکرد، پێستە تەنک و ناسکەکەشی بە بوێریەکی بێوێنەوە لەبەر هەژموونی گوێزانە تیژە بێڕەحمەکاندا خۆی ڕادەگرت. خاولیەکی گەورەم لەدەوری ملە لەرزۆکەکەی ئاڵاند و تەواوی دەموچاویم داپۆشی، هەموو هەوڵێکیشم بۆ ئەوەبوو ئازاری پێستە بەساڵاچووەی نەدەم، ئەو پێستەی هێندە تەنکبوو دەمارۆچکەکانی سەر دەموچاوی بە ئاسانی دەبینران. لەبەر تەمەن و شەکەت و ماندووبوونی ژیانی پێشووی چاوەکانی بەقووڵاچووبوون، وە لوتیشی لەچاو لاوازییەکەیدا زۆر گەورە بوو. بەڵام هەتا ئێستاش شانازی بە قژە جەرگیەکەیەوە دەکرد — ئێستا کە سپی بووە — و

هەمیشە سام و هەیبەتی ئەو بەژن و باڵایەی خۆی پاراستبوو، نەیهێڵابوو باڵای ڕەونەقی خۆی لەدەستبدات.

ژوورەکەشی پڕبوو لە شتومەکی هەڵرژاو و هەڵپرژاوی تەمەنی پێشووی. ژوورەکەی وەکو هەورەبانی کەسێکی بەتەمەن وابوو کە پڕبێت لە گۆڤار و ڕۆژنامەی جۆراوجۆر و چەندین شتی هەمەجۆری دیکە. لەناو چوارچێوەیەکی گەورەدا چەند وێنەیەکی لە هەموو تەمەنە جیاوازەکانی پیاوێکی تێدابوو. لە وێنەیەکیاندا باوکم بە جلێکی شیک و کەشخەی دەریاوانی و بە تەوقێکی ئاسنینی پێش جەنگە مەزنەکە لێ دیار بوو. ئەوی تریش وێنەیەکی ڕەشوسپی خۆم و کچە بچکۆلەکەم بوو کە لە گۆڕەپانی گۆڵفەکە چرکاندبوومان. لە وێنەیەکی دیکەشدا یازدە ساڵان بووم، گوێیەکانم بۆ پێشەوە قووت بووبوونەوە و لە قوتابیەکی زۆر دڵساف و هیچنەزان دەچووم. وێنەکە بەشێوەیەک لە شێوەکان گاڵتەئامێزیەکی پێوە دیاربوو، وەکو ئەوەی پێم بڵێت لەو تەمەنەدا گەمژەیەکی تەواو بووم.

لە ڕیشتاشینی باوکم تەواو بووم و دەمووچاویم بەو جۆرە کۆڵۆنیایەی خۆی زۆر حەزی لێیەتی ساوغدا. ماڵئاوایی ئەمجارەمان لە ماڵئاواییەکانی دیکەی نەدەکرد، ئەمجارەیان بیریچوو ئاماژە بەو نامەیەی سەر مێزی نووسینەکەی بکات، نامەیەک کە کۆتا حەز و ئاوات و خولیاکانی تێدا نووسرابوو. لەدوای ئەوەوە یەکدیمان نەبینیوە. ئێستاش ناتوانم وا هەست نەکەم کە لەپاڵ ئەم دەریایەدا شێوەی زیندانیەکم.ئێستا ئەویش ناتوانێت جانتا گەورەکەی بەسەر قادرمە زۆر و زەبەندەکانی ئەپارتمانەکەیدا بهێنێتە خوارەوە، لەبەر لاوازی ئەو

قاچانەی کە نەوەد و سێ ساڵە بەکاریدەهێنێت. هەریەکێکمان و وەکو زیندانیەکین، ئەو بەشێوازی خۆی و منیش بەشێوازی خۆم، من لەناو جەستەمدا و ئەویش لە قاتی چوارەمی ئەو ئەپارتمانەی کە لێی نیشتەجێیە. ئێستا ئەوە منم هەموو بەیانیەک ڕیشم بۆ دەتاشن، کاتێکیش کە خشەخشی گوێزانە کۆنەکەی دەستی پەرستارەکە لەسەر پێستم هەستپێدەکەم، ئەوم بیر دێتەوە. هیواخوازم من ڕیشتاشێکی هەستمەندتر بووبێتم و ئازام نەدابێت.

ئێستاش جار جار دێ بۆلام و بە دەنگە لەرزۆک و پڕ خۆشەویستیەکەی قسەم بۆ دەکات. خۆی دەنگی کزە، وە ئەو ئامێرانەشی کە لە گوێچکەمدا دایانناوە کوالێتی هێندە بەرز نییە، بۆیە زۆبەری جار دەزانم قسە دەکات، بەڵام نازانم چیم پێدەڵێت. شتێکی زۆر قورس و ناخۆشە قسە بکات بۆ کوڕە ئیفلیج بووەکەی، ئەو کوڕەی کە من و خۆیشی دەزانین ناتوانێت وەڵام بداتەوە. وەهەروەها وێنە ڕەش و سپیەکەی کۆرسی گۆڵفەکەشی بۆهێناوم. تێنەدەگەیشتم بۆچی بۆیهێناوم، لەکاتێکدا دەیتوانی وەکو نهێنیەک لای خۆی بیهێڵێتەوە بێ ئەوەی بیهێنێت بۆلای کەسێکی وەکو من کە نایەوێت خەفەت بۆ ڕابردووی خۆی بخوات. لەناکاو کۆتایی هەفتەی ئەو بەهارەم بەبیرهاتەوە کە لەگەڵ دایک و باوکمدا لە ڕۆژێکی خۆرەتاوی کزەبایاویدا ڕۆشتبووین تا هەوایەک بگۆڕین. باوکیشم بە دەستوخەتە بەهێز و زبرەکەی نووسیبووی:ئەپڕیلی ١٩٦٣، بێرک-سور-مێر.

# ڕێکەوتێکی دیکە

ئەگەر پرسیار لە خوێنەرەکانی ئەلێکساندرێ دوماس بکەیت، بڵێیت حەزدەکەن ببن بە کام پاڵەوانی ناو نووسینەکانی دوماس، ئەوا د'ئارتاگنان یان ئێدمۆند دانتێس هەڵدەبژێرن. هیچ کەس بیرناکاتەوە لەوەی نۆرتییێت دێ ڤیللێفۆرت یان کاراکتەرێکی گوناهبار و خراپی نێو کۆرت ئۆف مۆنتێ کریستۆ هەڵبژێرێت. وەکو چۆن دوماس دەڵێت: "پیاوێکی زیندووی مۆمیاکراو، پیاوێک کە سێ بەشی جەستەی لەناو گۆڕدایە، پیاوێک بەهۆی نزیکبوونەوەی وادەی مردنیەوە نایتوانێت ببێتە خاوەنی هیچ خەون و ئاواتێک، پیاوێک دەبێت لە ترسان موچرکەی بە لاشەدا بێت". ئەم کەسە ناچیز و بێ گوێ و لێقەوماوە ببووە خاوەنی ناخۆشترین ڕاز و نهێنی. هەموو ژیانی وەکو کرمەلیقەیەک لەسەر کورسیە پێچکدارەکەی بەڕێدەکرد. تەنها لەڕێگەی قوچاندنی چاویەوە دەیتوانی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دیکەدا دروست بکات. ئەگەر یەکجار چاوی قوچاند مانای وایە وەڵامەکەی "بەڵێ"یە، ئەگەریش دووجار بوو مانای وایە وەڵامەکەی "نەخێر". لە ڕاستیدا بابەگەورە نۆرتییێر - کە چۆن کچەزا خۆشەویستەکەی پێیدەڵێت - یەکەم و کۆتا نەخۆشی قوفوڵبووی نێو ئەدەبە.

دوای ئەوەی مێشکم ئیسراحەتێکی وەرگرت پاش ئەو تەموموژەی بەبۆنەی نۆبەکەوە توشم بوو، دەستمکرد بە بیرکردنەوە لە باپیرە

نۆریتییێر. دووبارە کتێبی ژە کۆرت ئۆف مۆنتێ کریستۆم خوێندەوە، ئێستا لەنێو دڵی کتێبەکەدام و لە ناخۆشترین و ناچیزترین حاڵەتەکانی خۆمدام. بەڵام دووبارە خوێندنەوەی ئەم کتێبە سوودی زۆری پێگەیاندم. لە مێشکمدا یاریم بە بیرۆکەی نووسینی وەشانێکی نوێ و مۆدێرن و بتشکێنی ڕۆمانەکەی دوماس دەکردەوە. تۆڵەسەندنەوە ئەو هێزە ناوەکیەبوو کە ڕایدەکێشام بۆ ئەوەی ڕۆمانەکە بنووسم، بەس بەداخەوەم کە من لەم سەردەمەدام و مۆنتێ کریستۆش ئافرەتە.

لەبەر ئەوە کاتم نەبوو و نەمتوانی تاوان بەرامبەر ئەم خانمە بکەم. وەکو سزادانێک حەزم دەکرد ببم بە م.دانگلارس، فرانز د'ئێپینای، ئابێ فاریا یان بەلانی کەمەوە هەزار جار بنووسم "نابێت شاکار بەهەوەسی خۆم بنووسم". بەڵام چارەنووسی ئەدەب و نەخۆشیە دەمارییەکان هەڵبژاردەکەیان دژی هەڵبژاردەکەی من بوو.

هەندێ شەو واهەستدەکەم کە نۆریتییێری بابەگەورە بە کۆریدۆرەکاندا پیاسەدەکات و لەسەر کورسیە پێچکدارە کۆنەکەی بە خەمباییەکەوە بەدوای دڵۆپەیەک نەوتدا دەگەڕێت. بۆ ئەوەی بڕیارەکانی چارەنووس داپۆشم و لەبیری خۆمی ببمەوە، ئێستا پلانم ئەوەیە چیرۆکێکی کۆنی گەورە بنووسم کە پاڵەوانەکەی کەسێکی وەرزشەوانە، نەک ئیفلیجێک. کێ دەزانێ، لەوانەیە ئەمەیان سەربگرێت.

# خەونەکە

ئەو خەونانەی کە دیتومن هیچیانم وەبیرنایەتەوە، وەک بڵێیت یاسایەک بێت و بەسەرمدا چەسپابێت. هەرکاتێک لە گزنگی بەیانی نزیک دەبمەوە، هەموو خەونەکانی نێو مێشکم کاڵبوونەوەیەکیان بەسەردا دێت و دوایش تەفروتوونا دەبن. بەس باشە بۆ ئەو خەونانەی کە دێسێمبەری پێشوو بینیمن خۆیان دەخزێننە نێو یادگامەوە و وەکو ڕێکی تیشکی لیزەرێکیش ڕێک و ڕەوان بەبیرم دێنەوە؟ لەوانەیە بەهۆی لەهۆشچوونەکەمەوە بێت. لەبەری ئەوەی گرنگیەژی ئەوتۆ بە خوەنەکان نادەین، ئیدی ئەوانیش لەبیربردنەوەیان بە لێپرسراویەتی خۆیان نازانن. لەجیاتی ئەوە وەکو ئەوەی بیانەوێت گردێک دروستبکەن کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی ئاهەنگێک سازبکەن کە ڕووداوەکانی وەکو شانۆگەریەکی وشک و بێتام دووبارە و دووبارە دەبنەوە. ئەمشەویش یەکێک لەو ڕووداوانەم بەبیرهاتەوە.

لە خەوەکەمدا بەفرێکی خەستوخۆڵ دەبارێت. بەفرەکە یەک پێ چووە بە ئاسماندا لە ئاست ئەو گەراجە بەرزەی کە شێوەی زبڵدانێکی ئۆتۆمۆبێلە. لەگەڵ خۆشەویسترین هاوڕێمدا بەلایدا تێپەڕدەبین، بەلایدا ڕەت دەبین و لە سەرمانا سڕ بووین. سێ ڕۆژە هاوڕێ لەگەڵ بێرناردا دەمانەوێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو فەرەنسایەی کە مانگرتێنکی سەرتاسەری ئەژنۆی شکاندووە و سەرتاپا ئیفلیجی کردووە. دوای ئەوە لە یاریگایەکی زستانەی ئیتاڵیدا خۆمان بینیەوە و لەوێشەوە

ڤیتارۆچکەیەکمان دۆزیەوە کە بۆ شاری نیس بەڕێدەکەت. بەڵام بەهۆی ئەو پۆلیسانەی کە بۆ چاودێری مانگرتوەکان دانرابوون گەشتەکەیان پێ بڕین و لە ڤیتارۆچکەکە هێناینیانە خوارەوە بۆ ئەم دیمەنە چۆڵ و ناخۆش و وێرانکراوەی شار. پردێکی بەرزیش ئەمبەر و ئەوبەری زبڵدانی ئۆتۆمۆبێلەکە بەیەکەوە دەبەستێت ئۆتۆمۆبێلەکان بەشێوەیەک ڕیزبوون وەکو بڵێی یەک یەک لەسەر ئەو پردە سەد و پەنجا پێیە کەووتبنە خوارەوە و لەسەر یەک وەستابن. خۆم و بێرناردی هاوڕێم لەگەڵ پیاوەبازرگانێکی ئیتاڵیدا چاوپێکەوتنمان هەیە، کە لە شوێنێکی دوور لەچاوی هەموو کەسێکەوە و لەژێر پردەکەدا بارەگایەکی سەرکردایەتی بۆخۆی دروستکردووە. تەقە لە ئەو دەرگا زەردە ستیلە دەدەین کە ئاماژەیەکی پێوەیە و لێی نووسراوە " مەترسیدارە لەبەر ڤۆڵتە بەرزەکەی " و خشتەیەکی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کارەبای پێدا هەڵواسراوە. دەرگاکە دەکرێتەوە و ڕێگای چوونەژوورەوەش بۆ نێو ژوورەکە لە مۆزەخانەیەکی تایبەتی جلوبەرگ دەچێت، چەند چاکەتێک لەسەر ڕەفەیەکی بزۆک و بێشومار پانتۆڵ و مقەباگەلێکی زۆر و زەبەندە کە هەتا بنمیچەکە بەرزبوونەتەوە و بلوز و تیشێرتیان تێدایە. تا ئێستاش ئەو پاسەوانە بێ دەمولەبزە دەناسمەوە کە بە ئاماژەی قژی ئێمەی بۆلای خۆی بانگکرد. پاسەوانەکە ناوی : ڕادۆڤان کارادزیچە، ڕێبەری سەرەکی سربیە بۆسنەییەکانە. بێرنارد پێی دەڵێت "هاوڕێکەم کێشەی لە هەناسەدانیدا هەیە و تەنگەنەفەسە،" ڕادۆڤانیش دەمانچەکەی دەستی دادەنێت و دەمخاتە سەر مێزێک و دەمپشکنێت بۆ ئەوەی بزانێت داخۆ توشی نەخۆشی سیل نەبووم. دوای ئەوە بەسەر قادرمە لە

گڵاس دروستکراوە ڕازێندراوەکاندا دەچینە خوارەوە بۆ ئەوەی لەژێرزەمینەکەدا درێژە بە پشکنینەکەی خۆی بدات. دیواری ژێرزەمینەکە بە چەرمێکی ڕەش داپۆشراوە، کورسیە گەورە و ڕووناکیە خەفەکراوەکانی ژێرزەمینەکە، شێوەی ئەوییان زیاتر وەکو یانەیەکی شەوانە لێکردووە. بێرناردی هاوڕێم لەگەڵ خاوەنەکەی ئێرەدا دەکەوێتە گفتوگۆوە، ئەو خاوەنەی کە کت و مت لە جیانی ئەگنێلی سەرۆک لیژنەی کۆمپانیای فیاتی ئۆتۆمۆبێل دەچێت. لەهەمان کاتدا خانمە خانەخوێیەکی ئەوێ - کە بەشێوەزاری لوبنانی قسە دەکات - دەمبات و لەپاڵ بارێکی بچکۆلەدا دامدەنێت. لەجیاتی ئەوەی لەنێو یاخچاڵەکەدا پەرداخ و بتڵی پڕ لە خواردنەوەی تێدا بێت، کەچی ڕەوەیەک بۆری پلاستیکی لەکاتی کردنەوە یاخچاڵەکەدا هاتنە خوارەوە، ڕێک وەکو ئەوەی بۆ گەشتیارانی نێو فڕۆکە هاتبنە خوارەوە لەکاتێکدا فڕۆکەکەیان کێشەی تێدایە. مەیگێڕێکیش پێم دەڵێت دانەیەک لەو بۆریانە بکەمە دەممەوە. منیش بەقسەیان دەکەم و لەناکاو شلەیەکی عەنبەری تام زەنجەفیل لە بۆرییەکەوە دێت و دەچێتە ناو دەم و دوای ئەوە قورگم، لە تەوقی سەرمەوە تا پەنجەی پێم هەست بە گەرم و گوڕی و تین دەکەم. پاش ماوەیەک من دەمەوێ چیتر نەیخۆمەوە و لەسەر کورسیەکەم دابنیشم. بەڵام هێشتا دەبێت بیخۆمەوە و قوتی بدەم و بچوکترین جووڵەشم پێناکرێت. شێتگیرانە تەماشای مەیگێڕەکە دەکەم بۆ ئەوەی سەرنجی بەلای خۆمدا ڕاکێشم. ئەویش بە زەردەخەیەکەوە وەک بڵێی شتێکی لەپشتەوەیە وەڵامم دەداتەوە. ئەو دەنگ و ڕەنگ و دەموچاوانەی دەوروپشتم خەریکە بەرەبەرە کاڵدەبنەوە و لەپێشچاوم

تێکدەچن. بێرناردیش شتێک بەگوێمدا دەچرپێنێت، بەڵام ئەو دەنگەی کە لە دەمی دەردەچێت، تێگەیشتنی لەم حاڵەی مندا شتێکی نەکردەیە و تێیناگەم. لەجیاتی دەنگی ئەو گوێم لە دەنگی ڕافێل بۆلێرۆیە. دوای ئەوە دەزانم بەتەواوی دەرمانخوارد کراوم.

پاش ماوەیەکی دووروودرێژ بە زەنگی مۆبایلێک خەبەرم دەبێتەوە. خانمە خانەخوێیەکە لەسەر پشتی خۆیم دادەنێت و بەسەر قادرمەکاندا دەڕواتە سەرەوە. "دەبێت لێرە نەمێنین، پۆلیس بەڕێوەیە بۆ ئێرە. هەر ئێستا دەبێ هەڵێین!" لەدەرەوەش شەو داهاتووە و بەفریش چیدی نابارێت. سووکەبایەکی کەلەتەزێن بواری هەناسەدانم نادات. پۆلیسەکانیش ئەو لایتانە بەکاردەهێنن کە چاو ڕێشکەوپێشکە پێدەکات. لەسەر پردەکەوە لەو ئۆتۆمۆبێلە جێ هێڵدراوانەی سەری وورد دەبنەوە و پشکنینی بۆ دەکەن.

بڵندگۆ گەورەکان دەنگێکی بەرزیان لێدەهات و دەیانوت "چواردەورتان بە پۆلیس تەنراوە، خۆتان بەدەستەوە بدەن" هەوڵی هەڵهاتن دەدەین و دەمانەوێت خۆمان لەپێش چاویان ونکەین، بەڵام من وەکو غەوارەیەکی سەرخۆش نازانم چی دەکەم و بەرەو کوێ هەنگاو دەنێم. زۆر حەزدەکەم هەڵبێم و خۆم ڕزگار بکەم، بەڵام هەرجارێک دەمەوێت هەنگاو بنێم بێهێزیەک ڕێم پێدەگرێت و ناهێڵێت تاکە هەنگاوێکیش بنێم. لە ئێستادا زراومچووە و شێوەی مرۆڤێکی مۆمیاکراوم، وەکو ئەوە وایە لە گڵاس دروستبووبم و هەر لە ئەزەلەوە توانای جووڵانم نەبێت. بەڵام ئەوە تەنها شت نییە کە من لێی دەترسم، بەڵکو لە هەمانکاتدا بارمتەی کەسانێکی لێوانلێو لە نهێنیم کە

دەترسم هاوڕێکانیشم وەکو من بکەونە نێو ئەم تەڵەیەوە. کۆڵەوارانە دەمەوێت ئاگادایان بکەمەوە، بەڵام خەونەکەشم وەکو ڕاستی لێهاتووە، توانای دەربڕینی یەک وشەشم نییە.

## ڕەنگی نهێنی

لەو کاتەوە ئەزمـوونی بەئاگاهێنـانەوەیەکی هێنـدە نەرم و نیـانم نەکـردووە! بەیـانیەکی کۆتـایی مـانگی یەک، دەرمانکـاری نەخۆشـخانەک کە پسـپۆڕی چـاو بـوو، خـۆی بەسـەر منـدا نووشـتانبووەوە و چـاوی ڕاسـتمی بە دەرزی و دەزوو شـێوەی گوێرەویەک دەدوریەوە. ترسێکی بێمانا و بێ ئەرزش لەش و ڕۆحمی تەنیبوو. باشە ئەی ئەگەر ئەم پیاوە لەگەڵ چاوی ڕاستمدا چاوی چەپیشمی بدورێتەوە چی بکەم؟ ئەو چاوەی کە بووەتە هەموو پەیوەندیەکی من لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا، ئەو چاوەی بووەتە تەنها پەنجەرە و دەلاقەیەک بۆ زیندانەکەم، بووەتە کرانەوەیەکی بچووکی زەنگۆڵە نووقومبووەکەم. بەختێکی باشم هەبوو دوایی کە زانیم دەتوانم ببینم و هێشتا کوێرایی بەسەر هەردوو چاومدا نەهاتووە. ئالەتی دوورینەوەکەی بە ئەسپایی و وریاییەوە کردەوە ناو جانتا قەڵەوەکەی خۆی. پاشان وەکو شکاتکارێکی بەردەمی دادگا کە داواکارەکەی بەردەمی بە تاوانبار دەزانێت بەدەنگی بەرز نەڕاندی "شەش مانگ!". یەک دنیا ئاماژەم بە چاوی چەپم کرد بۆ ئەوەی سەرنجی پزیشکەکە بەلای خۆمدا ڕابکێشم، چەند چاوم قووچاند تا بۆ یەک ساتیش بێت ئاگاداری من بێت، بەڵام ئەم پیاوە – پیاوێک کە چەندین ڕۆژی لە ڕوانین لە بیلبیلەی چاوی خەڵکیدا بەسەربردووە – لە هیچکام ئاماژە و تەماشاکردنەکانی من تێنەگەشت. بە سەرە خڕ و لاشە بچووک و ڕەفتارە سەیرەکانیەوە لە

پزیشکێکی کەمتەرخەم دەچوو، لە دانەیەکی لووتبەرزی فشەکەری قسەلەڕووی لە هەمانکاتیشدا گاڵتەپێکەر دەچوو. لە پزیشکە دەچوو کە بە نەخۆشەکانی دەڵێت کاتژمێر هەشت ئامادە بن و خۆشی کاتژمێر نۆ ئامادە بێت، وە نۆ و پێنج خولەکیش نەخۆشەکان بەجێبهێڵێت دوای ئەوە چل و پێنج چرکەی لە ساتە بەنرخەکانی پێشکەشی نەخۆشەکانی کردووە. پزیشکێکی دوورەپەرێز لە نەخۆشەکان، وەکو بڵێیت بەهانەیەکی هەیە تا لەگەڵ نەخۆشەکانی وەکی مندا پەیوەندیەکی هاوڕێیانەی نەبێت، یان وەک ئەوەی هەر لە سەرەتاوە هاورێیەتی لە خولقیدا بەرجەستە نەبووبێت. هەر بە خۆشی نەیدەتوانی هیچ وشەیەک بدۆزێتەوە تا بارودۆخی خۆمم بۆ ڕوونبکاتەوە. بەڵام پاش ئەوە زانیم کە بۆچی دەبێت تا شەش مانگ چاوم دوراوە بێت، لەبەر ئەوەی ئەو قەپاغەی وەکو داپۆشەرێک لەسەر چاوی ڕاستم دایاننابوو، بە باشی چاومی نەدەپاراست. منیش دەبوایە لە مەترسی برینداربوونی کۆرنیەی چاوم پارێزراو بم، بۆیە چاوی ڕاستمیان دوریەوە.

دوای چەند هەفتەیەک وا بیرمدەکردەوە ئایا نەخۆشخانەکە خۆیان بە ئەنقەست کاریان داوە بە پزیشکێکی ئاوا بلح و نەخوازراو و ناشرین، یان بۆ ئەوەی زووتر نەخۆشەکان باوەڕیان بە پزیشک و بگرە ناوبانگی پیشەی پزیشکیش نەمێنێت؟ یان بۆ ئەوەی نەخۆشەکان هەموو تاوانباری و گوناهی نەخۆشیەکەیان بنێنە ملی پزیشکەکە و بیکەن بە خاوەنسوچی نەخۆشیەکەیان؟ باشە ئەی ئەگەر ئەو پزیشکە نەخۆشخانەی بێرک بەجێبهێڵێت –شتێکە گومانی تێدا نییە – ئیتر من مۆڕە لە کێ بکەم؟ نابێت لەوە زیاتر لەم تەنیایی و

بێدەرەتانییەدا گوێ لە پرسیارە خۆشەکانی ئەو دوو پزیشکە بگرم کە پەنجەیان لەشێوەی هێمای سەرکەوتندا نیشانم دەدەن و دەڵێن: "یەک پەنجە دانە دەبینیت یان دووان؟ " منیش لەناخی خۆمدا بە تووڕەییەکەوە دەڵێم " نا نا یەک دانە نا، بەڵکو دوو قوندەر دەبینم. "

لەم حاڵ و گوزەرانەمدا ئەوەندەی پێویستم بە هەناسەدانە، هێندەی پێویستم بە ژیانە، ئەوەندەش ئاتاجی ئەوەم کە خەڵکی منیان خۆشبوێت و گرنگیم پێبدەن. تاکە شتێک کە ئێستا مانا دەبەخشێت بە ئەو کاتژمێرانەی ماومە لەژیاندا، بریتیە لە گەشتنی نامەیەک لەلایەن هاوڕێیەکمەوە. نامەکە بە ڕەنگێکی دڵگیر ڕەنگڕێژ کرابێت و پەڕەکانی بە جوانیەکانی قەشە سیمۆن ڕازێندرابێتەوە. بەڵام بۆ ئەوەی مێشکم بەجوانی کاربکات و گەردی لەسەر نەنیشێت، لەپێناو وازهێنان لە هاتنەخوارەوەیەکدا کە ئیدی هیچ سوودێکی نییە، دەبێت هاوسەنگی نێوان ئارامی و تووڕەبوون ،یان دڵخۆشی و دڵتوندیم ڕابگرم. نە زۆر زۆر، نە زۆر کەم، هەر ڕێک وەکو مەنجەڵێکی بوخار کە سەرەکەی ناهێڵێت بتەقێتەوە. دەمەوێت نە بتەقێمەوە، نە بکوژێمەوە.

ئێستا کاتی خۆیەتی با بیڵێم. مەنجەڵی بوخار دەکەم بە سەرەبابەتی شانۆیەک، شانۆیەک لەوانەیە ڕۆژێک بێتە نووسین، نوسینێک کە ئەزموونەکانی ئەم ڕۆژانەم ڕۆح بەبەر پەڕەکاندا دەکەن. بیرم لە ناوگەلێکی تریش کردووەتەوە، وەکو چاوەکە یان – بەدڵنیاییەوە – زەنگۆڵە نووقومبووەکە. تۆ ئێستا شانۆکە دەخوێنیتەوە و ئاگات لە هەموو پلان و دیمەنێکیەتی. "لە ژوورێکی نەخۆشخانەکەدا، بەڕێز

(ل) پیاوێکی خانەدان و کەسێکی خۆشڕیاو، فێردەکرێت چۆن لەگەڵ نەخۆشـەیەکەدا بـژی، نەخۆشـیەک کە پێـی دەڵـێن قووفڵبـوون و نۆبەیەکی مێشکی بەسـەریدا هێنـاوە. شـانۆیەکە سەرکێشیەکانی بەڕێـز (ل)ی تێـدایە لە کـاتی نەخۆشـیەکەیدا، هـاوڕێ لەگەڵ پەیوەنـدیەکانی خـۆی لەتەک هاوسـەر و منـداڵ و هـاوڕێ و ئەو یاریـدەدەرەی کە لە کـاری ڕیکلامکردنـدا نایـابە و بـووە هۆکـاری دەرکەوتنی بەڕێز (ل). کەسێکی بەرزخواز، پیاوێکی بەرژەوەندیخواز و نـامۆ لەگەڵ شکسـتەکاندا پێناسـەیەکی تەواوی بەڕێـز (ل)یە. بەڕێـز (ل)یەک کە هەنگـاو دەنێـتە نێـو ناخۆشـی و تـاریکیەکەوە، هەمـوو ئەو شـتانەی کە بـۆ سـاتێکیش بەگومـان نەبـووە لێیـان یـان دڵنیابووەلە ڕاستی و دروستیان، یەک یەک لەبەردەمیدا دەڕوخێن و لەناودەچن. وە دواتـر بـۆ دەردەکەوێت کە کەسە هەرە خۆشەویست و دڵسـۆزەکانی، خەڵکـانی نـامۆ و نەناسـراوی نێـو نەخۆشـخانەکەی خـۆین. دەتـوانین ئەم پیـاوە ببەیـنە پێشـی باڵکۆنێـک و دەنگێکـی دەسـکردی بـۆ دابنێـین کاتێـک ڕووبەڕووی ئەم بـارودۆخە نـوێیەی دەبێتەوە. بەس ئەوەنـدە مـاوە شانۆکە بنوسم، ئەگینـا هەمـوو شتێکم ئامـادەیە. تەنـانەت دیمەنـی کۆتـایی شانۆگەریەکەشم دانـاوە: سـەر شانۆکە هەمووی داپۆشراوە بە تاریکیەکی نووتەک، هیچ دیار نییە جگە لە ڕووناکیەکی بـازنەیی کە ڕێـک بەسـەر پـێخەفەکەوەیە. شـێوەی لە مـۆتەکە و کـابووس دەچێـت، هەمـوو کەس خەووتـووە. لەناکـاو بەڕێـز (ل) هەڵدەسـتێتەوە – دوای ئەوەی پەردەی شـانۆکە لابراوە – و چەرچەف و پشتیەکە هەریەکەو بەلایەکدا فڕێیـان دەدات و لە سـەر جـێخەوەکە بـاز دەداتە خـوارەوە و بەدەوری سـتەیجی

شانۆیەکەدا دەسوڕێتەوە – کە بەشێوەکەی نامۆ و ترسناک ڕووناکە – دوای ئەوە تاریکی باڵدەکێشێتەوە بەسەر شانۆکەدا و گوێتان لە دەنگی بەڕێز (ل)یە کە بۆ دواجار دەڵێت ،"بەنەفرەت بێت، بەس خەونێک بوو و هیچی ترا!"

ئەو ڕۆژەی بەخت یاوەرم بوو

ئەمڕۆ دوای ئەوەی ڕۆژ لە ژووری ١١٩ هەڵهاتبوو و هەڵنەهاتبوو، ڕۆحە شەڕەنگێزەکان دابەزینە ناو جیهانەکەم. ئەو ئامێرەی کە کاتی هاتنی ژەمە خواردنم دێت دەست دەکات بە بیپ بیپ کردن، نیو کاتژمێر بوو هەر لەخۆڕا بیپە بیپی دەکرد. باوەڕناکەم شتێک لەو بیپ بیپە ئیزعاجتر هەبێت، دەڵێی دەنگەکە وەکو شتێکی تیژ دەکەی بە مێشکمدا ئەوەندە ناخۆشە و ناسازە. هەر بۆ ئەوەی جەوەکە خۆشتر ببێت، ئەو تیپەی کە چاومی بە کراوەیی ڕاگرتووە ئارەقی نێو چاوانم بێفەڕی کردووە و کار ناکات، وە برژانگەکانیشم تێکئالاون و ئەوەندەی تر ئازاری چاوم دەدەن، ئازارێکە ناتوانم بەرگەی بگرم. شتێکی تر کە ئیتر هەر زۆر خۆشە، ئەو بۆریەی کە بۆمیان داناوە تا میزی لێوە بکەم، جوڵاوە لە شوێنەکەی و منیش وەکو منداڵێکی ساوا میزم بەخۆدا کردووە و خووساوم. لەچاوەڕوانی بەهاناوەهاتمندا گۆرانیەکی کۆنی هێندری سالڤادۆرم لەژێر لێوەوە دەووتەوە، "مەترسە بچکۆڵ، هەموو شتێک باش دەبێت." وە

پەرستارەکە دێتە ژوورەوە و دەمودەست تەلەڤیزیۆنەکە دادەگیرسێنێت. ڕیکلامێکە، کۆمپیتەرێکی تێدایە بە دەڵێت "ئایا هەر بەم بەختەوە لەدایکبوویت؟"

## مەریەمی کچ

کاتێک هاوڕێکانم بەقەشمەریەوە پێم دەڵێن "بەتەما نیت حەجێک بکەیت بۆ لۆوردێس؟" منیش پێیان دەڵێم کە پێشتر کردوومە. کۆتایی حەفتاکان بوو، من و جۆزێفین لە پەیوەندیەکی سۆزداریدا بووین، پەیوەندیەکەمان بەجۆرێک بوو نەمدەزانی ئایا دەبێت بەیەکەوە بڕۆین گەشتێک ئەنجامبدەین یاخود نا. دوای ئەوە بۆم دەرکەوت کە ئەم گەشتە بەژمارەی ئەو میکرۆبانەی کە خواردنێک بۆگەندەکەن و بەژمارەی خولەکەکانی ناو ڕۆژێک ئەگەری تێکچوونی هەیە. بەیانی دەرچووین و نەماندەزانی شەو لە کوێ سەردەنێینەوە – تەنانەت نەشماندەزانی چۆن بگەینە ئەو شوێنەی کە دەمانەوێت گەشتی بۆ بکەین. قسەزانی شتێکە کە دەبێت لەو دوو کەسەدا هەبێت کە گەشتێکی لەوشێوەیە دوور و درێژ پێکەوە دەکەن. جۆزێفین جۆرە کەسێک بوو کە ئامادەبوو هەموو شتێک بکات هەتا لەسەر ڕێی خۆی بەردەوام بێت، کەسێک بوو کە تا سەر ئێسقان لەسەر قسەی خۆی سوور و منجڕ بوو، منیش هەر لەو جۆرە بووم. بۆ ماوەی هەفتەیەک ئۆتۆمۆبێلە ڕەنگ شینە ئاسمانیە بێ سەقفەکەمان بووبوە شانۆگەریەکی گەڕۆک کە باسی قەیرانە خۆماڵیەکانی تێدا دەکرا. بەسەر چیای ئاکس-لێس-سێرمیس شاخڕەویەکم ئەنجامدا، بەس دەتوانم بڵێم کە هەموو شتێک بوو بێجگە لە شاخڕەوی. بە مانایەکی دی: خاڵی بوو لەو مەبەستانەی کە کەسێکی شاخڕەو دەیەوێت پێیان بگات. لەکاتی شاخڕەویەکەدا

سەرێکمان دا لە چامبرێ دی'ئامۆر و کەنارەدەریایەکی بچووکی باسک، ئەو شوێنەی کە خاڵی جۆزێفین ڤێللایەکی تێدا دروست کردبوو. لەوێوە وەکو ڕەشەبایەکی زرت پەڕینەوە بۆ پینێنیس. ئەو شوێنەی کە بۆی دەڕۆشتین لەچاو ئەو شوێنانەی گەشتمان بۆی کردبوو وەکو ئەوە وابوو هیچمان نەبینیبێت.

بڕبڕەی پشت و گرنگترین بەشی ئەم گەشتە، کە لە کۆششێکی سەربازی دەچێت، کتێبێکی ڕووکار قەڵەوی شەشسەد بۆ حەوسەد لاپەڕەیی بوو. کە بەرگێکی ڕەش و سپی و ناونیشانێکی سەرنجڕاکێشی هەبوو. ناوی شوێن پێی مارەکە بوو، چارلز سۆبراج نووسیبووی. نووسەری کتێبەکە پیاوێکی پیرۆزی پیادە بوو کە یەکەمجار گەشتیارەکانی نێوان بۆمبای و کاسماندوی سەراسیمە و سەرسوڕماوی دەکرد، وە پاشانیش وەکو چۆن کەسێک بتەکێنیت ئاوا تاڵانی دەکردن. چیرۆکەکەی سۆبراجی نیوە-فەڕەنسی و نیوە-هندی زادەی ئەزموونی ڕاستی کەسێک بوو. بێجگە ئەوە هیچ شتێکی دیم بیرنایەتەوە، لەوانەشە ئەو شتانەشتی لەبارەی گەشتەکە گێڕاومەتەوە بەتەواوەتی ڕاست نەبن. بەڵام ئەو شتەی کە بەتەواوەتی لە بیرمە و هەرگیز لەبیرم وەدەر ناکەوێت، ئەو جادوو بوو کە چارلز سۆبراج لێی کردم. لەڕێگەکەماندا کە لە ئەندۆرا دەهاتینەوە پێم ئاسایی بوو سەرێک لەسەر کتێبەکە بەرزبکەمەوە و تەماشایەکی دیمەنەکە بکەم، بەڵام کاتێک گەشتینە پیک دو میندی — کە لە باشووری فەڕەنسایە — لە ئۆتۆمۆبێلەکە دابەزیم و بەپیاسە دەڕۆشتم. نەمدەهێلا یەک نوقتەش چیە لە دیمەنەکە لەدەستم بچێت بێ ئەوەی من سەیری نەکەم. لەڕاستیدا تەمێکی خەستی زەردباو

وەکو چەرچەفێک چیاکەی داپۆشی بوو، تەمێک کە لە جوانی و قەشەنگی ئەم پیاسەکردنە و دیمەنی دڵڕفێنی چیاکەی کەمدەکردەوە. سەرەڕای ئەوەش جۆزێفین دوو کاتژمێر لەوێ بەتەنها بەجێیهێڵام و بەتەنها خۆی بە تەمەکەدا هەڵدەشاخا. تۆ بڵێیت ئەم گەشتە بۆ دەرکردنی جادووی ئەژدیهاکەی ناو لەشم بێت لەکاتی ڕۆشتنمان بۆ لۆوردێس جۆزێفین یەکجار جەختی لەسەر دەکردەوە؟ بەهۆی ئەوە قەت ئاشنا نەبووبووم بەم پایتەختی دەراساییانە، بۆیە بەخۆشحاڵییەوە ڕازی بووم. لە بار و دۆخەکەی مندا، ئەو بارودۆخەی مێشکم وەک بڵێی تووشی تا بووبێت و بەتەمای تەقینەوە بێت، چارلز سۆبارج تێکەڵ بە بێرنادێت و ئاوەکانی ڕووباری ئەدۆر تێکەڵ بەوانەی گانگێس بووبوو.

ڕۆژی دواتر چیایەکمان بڕی و بەڕێگای تۆور دێ فرانسدا ڕۆشتین بۆ لۆوردێس، ڕێگاکەی زۆر ناخۆش بوو. پڕبوو لە هەڵبەز و دابەز و چاڵ و چۆڵی، نەک من بەڵکو ئۆتۆمۆبێلیشی هیلاک و ماندوو دەکرد. ئەوەندە گەرم بوو، خەریک بوو لە گەرمان بخنکێین. جۆزێفین ئۆتۆمۆبێلەکەی لێدەخوڕی و منیش لای سەکن دانیشتبووم. چیرۆکی "شوێن پێی مارەکە"ش لەدواوە بە سەر و بیچمێکی قەڵەو و ئاوڵساوەوە جێی خۆی کردبوویەوە. لەبانیەوەڕا نەمدەوێرا یەک پەنجەشی لێ بدەم. جۆزێفینیش لە مێشکی خۆیدا بڕیاری دابوو کە: سەرسامبوونەکەی من بەم پیاوە پیرۆزە، لە گرنگیدانم بە ئەوی کەمکردووەتەوە. ئەو ڕۆژە قەرەباڵغترین ڕۆژی حەجەکە بوو. منیش کەوکوژی بەدوای هۆتێلێکدا دەگەڕام بۆ ئەوەی دوایی بە شانهەڵتەکاندنێکەوە پێم نەڵێن "ببورە جێگە نەماوە".

ئارەق کراسەکەی بەرمی بە سنگمەوە نووساندبوو. وە بیرۆکەی ئەوەی تووشی دەمەقاڵەیەک دەبم ئەو کاتە سەریهەڵدا کە پێشوازیکەرانی هۆتێلی د'ئانگلێرێتی، د'ئێسپاژێ یان دێس باڵکانس پێیان ڕاگەیاندم کە شوێنگرتنەکەمان هەڵوەشاوەتەوە. بە تۆنێکیەوە کە لە لووتبەرزی زیاتر هیچی دیکەی پێوە دیار نییە، شێوەی پارێزەرێک کە لەناکاو بە میراتگرەکانی خاڵیان بلێت خاڵە دەوڵەمەند و پارەدارەکەتان مردووە هاواریان بەسەردا دەکردی. درۆیاندەکرد، جێگای بەتاڵیان هەبوو. وازم هێنا لە وتنی "ئەمەش دەراسایەکی کاتی حەجە." لەبەر ئەوەی هەستێک لەناخمدا پێی دەوتم لە لۆوردێس دەبێت خۆم لەم قسانە بگرمەوە و ئاگام لە دەمی خۆم بێت. بەرزکەرەوەکەش ئەوەندە فراوان بوو کە جێگەی قەرەوێڵەی نەخۆشی تێدا دەبووەوە. دوای ئەوەی دە خولەکیش لە گەرماوەکە مامەوە بۆم دەرکەوت کە تەوالێتەکەشمان بۆ کەسی خاوەن پێداویستی تایبەت دروستکراوە.

کاتێ جۆزێفین لە گەرماوەکە بوو، منیش تەنها خاولیەکم لەخۆم پێچابوو، لەوپەڕی تینوێتیدا بووم و خەریک بوو دەخنکام، بۆیە نیشتمە سەر ئەو یەخچاڵە بچووکەی لە ژوورەکەدا دانرابوو. هەر بە یەکەمجار بتڵێکی ئاوم نیوەکرد. چ بتڵێکی مەزن بوو، هەرگیز ئەو تامە بەهەشتئاسایەی لەسەر لێو و قوڕگ وشکەکەم لەبیرناکەم! پاشان پەرداخێک شامپانیا بۆ جۆزێفین و دانەیەک جین و تۆنێکم بۆخۆم تێکرد. دوای ئەوە ئەرکی خۆم وەکو مەیگێڕێک بەجێ هێنا، بیرم دەکردەوە چۆن خۆم بدزمەوە تا کتێبەکەی چارلز سۆبراج بخوێنمەوە. بەڵام لەجێگای ئەوەی خانمەکەم سەرخۆش بێت، ئەو

شامپانیایە هەموو جۆش و خرۆشە گەشتیاریەکەی بە بەر هێنایەوە و وتی "دەمەوێت مریەمی کچ ببینم." هەر کە وای وت و وەکو فرانچۆیس ماوریاک لە وێنە بەناوبانگەکەیدا بە جووتە پێ بازیدا.

لەبەر خاتری جۆزێفین، لەژێر ئاسمانێکی ترسناک و قورسدا ڕۆشتین بۆ ئەوەی ئەو پیرۆزیە ببینین. بەلای ڕیزێک کورسی پێچکداردا تێپەڕبووین کە خۆبەخشەکان دەیانوت (بەقسەی خۆیان) باشترین پارێزەری ئەو کەسانەیە کە ورگ بەرەوخواریان لەکار کەووتوە. خانمە ڕەبەنێک کە ڕێوڕەسمەکەی بەڕێوەدەبرد، بە کڵاوێکی خوساوەوە وتی "گەر دڵۆپە ئاوەکانی ئاسمان دەستیان بە بارین کرد هەمووتان بچنە ناو کەنیسەکەوە." تەزبیحەکەی تووند بە دەستیەوە نووسابوو. بە نهێنیەوە تەماشای ئەو دەستە نەتوان و کەنەفت و دەموچاوە داخراو و ئەو ژیانە دەکرد کە سەپاندبوویان بەسەری خۆیاندا. یەکێکیان پێی زانیم و منیش لە حەیبەتدا زەردەخەنەیەکم کرد. ئەویش بەشێوەیەکی زۆر نائاسایی وەڵامی دامەوە، کە هەموو دەموچاوم لەشەرمان سوور هەڵگەڕا وەکو ئەوەی لە تاوانێکدا گیرابم. ئەو بە زمان دەرهێنانێک وەڵامی منی دایەوە. جۆزێفینیش بە کالە و پانتۆڵ و بلوزێکی پەمەییەوە لە پێش ئەو کۆمەڵە قەشەیەوە بەدڵخۆشیەوە ڕێیدەکرد (ئەو قەشە فەڕەنسیانەی کە بۆ ڕێوڕەسمێکی وەکو ئەمڕۆ جلوبەرگیان لەبەرکردووە). جۆزێفین خەریکبوو لەخۆشیان لە هۆش خۆی بچێت کاتێک کۆمەڵە قەشەکە وتیان "مەریەمی کچ، وا لەسەر ئەژنۆ بۆت کەوتووین، دە دەرکەوە." ئەوە ئەو دووعا و سروود و گۆرانیە بوو کە جۆزێفین بە منداڵی دەیوتەوە. جەوەکەی ئەوەندە بە جۆش بوو

ئەگەر کەسێک لەدوورەوە تەماشای بکردایە وای دەزانی یاری یۆرۆی ئەوروپییە لە پارک-دێ-پرینس.

ڕیزێک گۆرانی ئاڤێ ماریسیان دەوتەوە، جا چ ڕیزێک! هەر بە نار ڕیز بوو! ڕیزێک کە نیو میل درێژیەکەی بوو لەلای ڕۆخی دەریاکەوە هەتا پێش دەروازەی ئەشکەوتەکە. تا ئێستا ڕیزێکی ئاوهام نەدیتووە، مەگەر لای گۆڕی لینین لە مۆسکۆ.

بە جۆزێفینم وت "بەهیچ شێوەیەک لەم سەرەیەدا چاوەڕێ ناکەم."

جۆزێفینیش وتی "ئای کە گوناحی، بۆ گوناحکارێکی وەکو تۆ ئەمە خێرێکی زۆر گەورەیە!"

منیش ووتم "بەهیچ شێوەیەک وا نییە، لەوانەیە مەترسیداریش بێت. ئەدی باشە چی دەبێت ئەگەر کەسێکی بێ عەیب و ساغ و سەلامەتی ئێرە لەکاتی دەرکەوتنی مەریەمی کچدا لە سەراسیمەبووندا ئیفلیج ببێت؟"

یەک دەرزەن حاجی ڕوویان وەرگێڕا بۆ ئەوەی بزانن کێ بەم شێوە بێ ڕێزیە قسەی کردووە. جۆزێفینیش بە دەنگێکی نزم وتی "هەی گێژ!". دوای ئەوە بارانێک هەموو ئەو سەرنجانەی لەسەر من بوون لای برد. کە بارانەکە نمە نمە دەباری هۆردوویەک لە چەتر شێوەی ئەو ناوەی کرد بە شێوەی دارستانێکی پڕ لە دار، وە بۆنی خۆشی خۆڵە باراناویەکەش ئاسمانی ئەو ناوەی تەنی بوو.

دوای ئەوە بەڕێیان کردین بۆ ژێرزەمینی کڵێسەی "س.ت". پەڵس ئێکس ئەو شوێنە بوو کە دووعایەکی لێخوێندرا کە لە کاتژمێر شەشی بەیانییەوە درێژەی دەکێشا هەتا نیوە شەو، هەر دوو یان سێ کاتژمێر جارێک قەشەیەک جێگۆڕکێی لەگەڵ قەشەیەکی دیکەدا دەکرد تا ڕێوڕەسمەکە بەڕێوەبەرێت. لە ڕێنمایەکەدا خوێندبوومەوە کە دەستەی قەشەکانی ئێرە شوێنی مانەوەیان بۆ سەرنشینی چەند فرۆکەیەکی گەورە هەیە. دوای جۆزێفین کەوتم بۆ قوژبنێک کە کۆمەڵێک کورسی بەتاڵی تێدابوو، قوژبنێک کە دەنگی دەدایەوە بەهۆی ئەوەی لەژێر ئەو هەموو بڵندگۆیانەدا بوو کە ڕێوڕەسمەکەیان دەگواستەوە. تێکڕا بە یەک دەنگ دەیانوت "شکۆ بۆ خودا، کە بەرزترینە ....بەرزترینە ... بەرزترینە" دوای ئەوەی ژمارەی خانەخوێیەکان زیادیانکرد، حاجیەکی لە پاڵمدا – کە وادیاربوو باش خۆی ئامادەکردبوو- دووربینێکی لە پشتەکۆڵەکەی هێنایە دەرەوە بۆ ئەوەی سەیری بەرەوپێشچوونەکە بکات. حاجیەکانی دیش – کە وا دەردەکەوت خۆیان باش ئامادە نەکردبێت و ئیمانیان لاواز بێت – دووربینێکی ئاساییان پێبوو کە لە هەموو شوێنێک دەتوانی بەدەستی بخەیت. باوکی جۆزێفین جار جار بۆی باسدەکردم کە چۆن ئەم جۆرە وردەوالانەی لەدەرەوەی وێستگەی میترۆکەدا فرۆشتووە. جێتەنگیەکەی ڕێگەی لەوە نەگرت کارەکەی باش نەڕوات و ئیشەکەی فراوان نەکات. ئیستاش سوودی لەو دەنگە بەرزەی وەردەگرێت کاتێک باسی هاوسەرگیریەکی بەوەفا و بەسۆز، یان بوومەلەرزە و شەڕی نێوان دوو کەس دەکات لە پێناو بردنەوەی خەڵاتێکدا. وا بارانەکە خۆشیکردووەتەوە و هەواکەش کەمێک

فێنک بووە. جۆزێفینیش وتی "با بڕۆین بۆ بازاڕ". پێشبینی ئەمەم کردبوو، بۆیە پێشتر تەواوی دوکانە یەک لەدوا یەکەکانی شەقامی گشتیم دیاریکردبوو کە شتی یادگاریان دەفرۆشت و ئەو هەموو جۆرە ئامێر و دیاریەیان هەبوو کە لە توانایدا بوو حەیرانی خۆیت بکات.

جـۆزێفین خـویەکی بـاش و لە هەمانکاتـدا وەرسـکەری هەبـوو. کەسێک بـوو کە هەمـوو شتەکانی لای خۆی خڕدەکردەوە، شتی وەکـو: شوشـەی کـۆنی عەتـر، گـوێنی (کە بەکاردەهێنـدرێت بـۆ داپۆشـینی گـامێش و مانگـا) وە دەوری و قاپانێـک بـۆ ئەوەی ئەو خواردنانەی تێدا دروست بکات کە چێشتخانەیەکی یابانی لە تۆکیۆ وێنەکەیـان بە جامخانەکەیـانەوە نووسـاندووە. بەکـورتی و پـوختی، لە گەشـتە جـار جارەییەکەمانـدا هەر شـتێکی بکەوتـایەتە بەردەسـت یەکسەر دەیکڕی، تەنانەت ئەگەر شتێکی بێفەڕیش بووایە. لۆوردێس ئەو شـوێنە بـوو کە لە یەک نیگـادا ئەشـقی جـۆزێفینی لە دڵمـدا چەقاند. لەلای پەنجەرەی چوارەم دوکانەوە لە چەپەکێکدا دانیشتبوو، بە کۆڵێـک مەدالیـای ئاینی، کـاتژمێری فەڕەنسـی، دەوریەک لە پەنیری ڕازاوە و نەخشەگەچینەیەکی بازنیەیی کە گڵۆپێکی پێوەیە و وەکو دارێکی ڕازاوەی کریسمس ڕازێندراوەتەوە.

بە دڵخۆشیەوکەوە جۆزێفین وتی "ئەوەتانێ. دیتمەوە، ئەوە مەریەمی منە!"

منیش یەکسـەر وتـم " ئەم دیـاریە بـا لەسـەر مـن بێت. خـۆم بـۆتی دەکـڕم"، بـێ ئەوەی گـوێ بـدەمە ئەوەی نرخـی گرانـی دیـاریەکە – لەبەر ئەوەی دیاریەکە تاک و نادیدە بوو و شتی وا لەو جۆرە نەبوو-

و دوکاندارەکەش چەند زیادە دەخاتە سەر. هەر ئەو شەوە ئاهەنگمان گێڕا لەپێناو ئەو دەستکەوتەی بەدەستمان هێنابوو، ڕووناکیە کزۆڵەکەی سەرەوەشمان سێبەری سەماکەمان لە بنمیچی ژوورەکەدا دەداتەوە. وتم "جۆزێفین، واهەستدەکەم دەبێت لە یەک جیابینەوە دوای ئەوەی گەڕاینەوە بۆ پاریس"

جۆزێفینیش وتی " وا دەزانی منیش درکم پێ نەکردووە"

منیش ووتم " بەڵام جۆ...."

جۆزێفین لە پرخەی خەوی دابوو. ئەو لەلایەن پەروەرێنەوە دیاریەکی پێبەخشرابوو کە هەرکاتێک ڕووبەڕووی کێشەیەکی لەم جۆرە بوویەوە و دۆخەکە هەراسانی کرد یەکسەر خەوی لێدەکەوێت. دەیتوانی بەدڵی خۆی چەند حەزی لێ بێت بخەوێت، ئیتر پێنج خولەک بوایە یان چەند کاتژمێرێک. بۆ ماوەیەک تەماشای دیوارەکەی پشت خۆمان و پشتیەکەم کرد و دوای ئەوەش خۆم فڕێدایە نێو باوەشی تاریکیەوە. ئایا کاریگەری دڕندە و شەیتانەکان بووە کە وای لەم خەڵکە کردووە هەموو دیواری ئەم ژوورە بە ڕیشاڵی پرتەقاڵی دابپۆشن؟

کاتێک جۆزێفین خەوتبوو، بە وریاییەوە جلەکانم کردە بەرم و ئەوم بەجێهێلا تا بە خۆشترین خولیام شاد ببمەوە. خولیاکەشم: پیاسەیەکی شەوانەیە. ئەوە ڕێگایەکی تایبەت بەخۆم بوو تا ڕووبەڕووی ناخۆشی و تەنگ و چەڵمەکان ببمەوە، ئەوەندە ڕێمەکرد هەتا لەناکاو زرمەمم بەزەویدا دەکەوتم. لەسەر شەقامەکە هەر لەدوور ڕا گوێت لە

قوورەی خواردنەوەی گەنجە هۆڵەندیەکان بوو. کونیان کردبوویە عەلاگەی زبڵ و کردبوویانە بەریان بۆ ئەوەی بارانەکە تەڕیان نەکات. شیشە گەورە و زبەلاحەکان ڕێگەیان گرتبوو لەوەی بچمە ناو ئەشکەوتەکەوە، بەس لە دەلاقەیەکی بچووکەوە بەسەدان مۆم دەبینم کە هێدی هێدی دەسوتێن. پاشان هەر بە پیاسە هاتمەوە بۆ شەقامەکە و بۆلای ئەو دوکانانەی کە شتی یادگاریان دەفرۆشت. لە چوارەم پەنجەرەدا مریەمێکی ڕاستی لە شوێنەکەی ئێمە دانیشتبوو. دوای ئەوە بەلای هۆتێلەکەی خۆماندا لامکردەوە، پەنجەرەکەی خۆمانم لە دووری دوورەوە دیت کە لە تاریکیدا دەجوولایەوە. بە ئەسپایی بەسەر پلیکانەکاندا چوومە سەرەوە، و بۆ ئەوەی خەوی کابرای چاودێر تێک نەدەم بە وریاییەوە دەرۆشتم. کتێبی شوێن پێی مارەکە شێوەی جەوهەرێکی درەوشاوە لەسەر سەرینێک بوو. منیش لەژێر لێوەوە وتم " باشە باشە ". " چارلز سۆراجم هەر لەبیر چووبوویەوە "

دەستوخەتی جۆزێفینم ناسییەوە. "ئی"یەکی زل و زەبەلاح لەسەر لاپەرەی ١٦٨مینی کتێبەکە نووسرابوو. ئەوە سەرەتای پەیامێک بوو کە دوو بەندی کتێبەکەی داگیرکردبوو.

" گێژە گیان، خۆشم دەوێیت. لەگەڵ جۆزێفینە داماوەکەتدا نەرم مامەڵە بکە "

بەخۆشحاڵیەوە ئەم بەشەم پێشتر خوێندبووەوە.

دوای ئەوەی گلۆپەکەم کوژاندەوە، ڕۆژیش دەستی کرد بە هەڵهاتن.

## لە تاریکی پەنجەرەکەوە

لەسەر کورسیە پێچکدارەکەم چەماومەتەوە و چاو لە منداڵەکانم و دایکیان دەکەم کە چۆن بە نامۆییەکەوە بە هۆڵی نەخۆشخانەکەدا دەمبەن. لەکاتێکدا من تەنها ڕۆڵی زۆمبیەک دەبینم، بووم بە باوکێکی زۆمبی بۆیان و هیچ جووڵەیەکم نییە، کەچی دیۆفیل و سێلێست زۆر زرت و زیندوون، عەجوول و دەنگەدەنگەرن. هیچ کاتێک وەڕزنابم لەوەی لەپاڵمدا بیانبینم، تەنها پیاسەشم لەگەڵدا بکەن هەر ڕازیم. کاتێک ئەو سیما و ڕوخسارە پتەوەیان دەبینم کە بووە بە دەمامکێک تا شوێنی باری قورسی من لەسەر شانی ئەوان بکاتەوە، زۆر هەست بە شانازی دەکەم. دیۆفیل لەکاتی ڕۆشتندا کلینیکسێکی گرتووە بە دەستیەوە و دەیهێنێت بە دەم و لێوە لیکاویەکەیدا. جووڵە و ڕۆشتنەکەی هەندێک دوودڵی و نیگەرانی پێوە دیارە، جووڵەکانی لەیەک کاتدا پڕن لە نەرمونیانی و ترس و تۆقین، ڕێک وەک ئەوەی ئاژەڵێکی کێوی ڕاگرتبێت و دڵنیا نەبێت لە کاردانەوەکانی ئەم ئاژەڵە. دوای ئەوەی هەنگاوەکانمان خاوکردەوە، سێلێست وەک چۆن منداڵێک دەخەیتە نێو بێشکەوە ئاوا سەری منیشی دەخاتە ناو باڵەکانی خۆی و ناوچاویشمی بە ماچە پڕ سۆز و خۆشەویستیەکانی دادەپۆشێت. دووبارە و دووبارە دەڵێت "تۆ باوکی منیت، تۆ باوکی منیت، ناتدەم بە کەس." وەک بڵێی دووعا بۆ ئەوە دەکات تا دنیا دنیایە من هەر باوکی ئەو بم و بەجێی نەهێڵم.

ئەمرۆ ڕۆژی جیهانی باوکانە. هەتا ئەم نۆبەیەم بەسەردا نەهات هیچ کاتێک ئەم ڕێوڕەسمە پڕ خۆشەویستیەم بۆ نەکرابوو. بەڵام ئەمڕۆمان زۆر بەجوانی و وەکو خۆی بەڕێکرد، لەبەر ئەوەی هێشتا سێبەرێک، وێنەیەک و بەشێکی بچووک لە من سیمای باوکێک پیشانی دوو منداڵە بچووکەمە دەدات. کە ئەوان دەبینم دەژین و پێدەکەنن و دەگرین و دەجوڵێن خەریکە لە خۆیشدا باڵدەگرم. وە لە هەمانکاتیشدا لەوە دەترسم ئەو خۆشیەی کە لەلای من دەستدەکەوێت، شتێکی ئەوەندە چێژبەخش و نموونەیی نییە بۆ دیۆفیلی دە ساڵان و سێلێستی هەشت ساڵانی خوشکی. بەڵام هەرچۆنێک بێت بڕیارێکی زۆر ژیر و حەکیمانەمان داوە کە هەموو شتەکان وەکو خۆی پیشان بدەین و بە دەمامکی شیرین و خۆشی ڕووە ڕاستیەکەی دانەپۆشین.

جێ سەیرانی خۆمان لە کەنار دەریای بیچ کلەب دادەمەزرێنین و لەوێ دەمێنینەوە، ناوی منیش لەسەر گردۆلکەیەکی لمین بەڕووی خۆر و بایەکەدا نووسراوە. هەر لەو شوێنەدا نەخۆشخانەکە لەخێری خۆی چەند مێز و کورسی و چەترێکی داناوە، و چەندین گوڵە بەهارەیان تێدا چاندووە بۆ ئەوەی گەورە ببێت و دیمەنێکی قەشەنگتر بەوێندەر ببەخشێت. جیاوازی نێوان خەستەخانەکە و ئەم کەناردەریایە وەکو جیاوازی لە نێوان گواستنەوە بە کورسی پێچکدار لەگەڵ ئۆتۆمۆبێلێکی کەشخەی ئاخرمۆدێلە. دیۆفیل پرسیار دەکات و دەڵێت "یاری پیاوی لەسێدارەدراو بکەین؟" منیش بەو هەموو ئێش و سۆیەی کە هەمە دەمویست بڵێم من ناتوانم یاریەکی لەو شێوەیە بکەم، چونکە من ئیفلیجم. بەڵام ئەو سیستەمە دەنگیەی بۆیان

داناوم توانای وەڵامدانەوەی نییە لەبەر ئەوەی: گەر خاوەنی تیژترین شمشێریش بیت، درەنگ بیخەیتەوە نێو کێلانەکەی خۆی ئەوا بە تێپەڕبوونی کات کول دەبێت و تیژیەکەی جارانی نامێنێت. کاتێک بەشمشێرەکە هێرش دەبەیت و گورزێکی توند دەدەیت لە کەسی بەرامبەرت، ئیتر بیر لەوە ناکەیتەوە چ ژیری و حیکمەتێکی تێدایە گەر لەم کابرایە بدەیت، لەحاڵەتێکدا ئەگەر حیکمەتیشی تێدابێت لەو کاتەدا هێندە بۆ تۆ گرنگ نییە. کەواتە دەبێت هەڵنەچوونی پێشوەختە بەرامبەر هاندەرەکانت بکەیت بە یاسا و رێسایەک و لە ژیانی ڕۆژانەتدا پەیڕەوی بکەیت. چونکە ئەو هەڵچوونە هیچ بوارێک بۆ گفتوگۆ و لێک تێگەیشتن ناهێڵێتەوە، بگرە ئەوەشی پێوەیەتی لێی دادەماڵێت. ئەم هەموو قەدرنەزانین و نانکوێریەی بەرامبەر بە شتەکان هەیە، وەکو ئەوە وایە لەیاریەکی تۆپی پێدا بیت و لەجیاتی تۆپ شەق لە ئەڵماس هەڵبدەیت. تەنها لەبەر ئەوەی شتەکان کەمێکێک هەزەلی بێت و بڕێک لە جدیەتی خۆی بکەوێت بەو شێوەیە ڕەفتار دەکەن، ئەم شتانەش حاڵەتەکەی منتان بۆ ڕووندەکاتەوە.

بەڵام بێگومان دەتوانین یاری پیاوی لەسێدارەدان بکەین. یاریەکە گەمەیەکی نیشتیمانی و خۆماڵیە بۆ ئەو کەسانەی کە هێشتا منداڵن یان نەگەشتوونەتە تەمەنی هەرزەکاری. شێوازەکەیشی ئەوەیە من پیتێک هەڵدەهێنم، دوای ئەویش پیتێکی دیکە، لە سێیەمیاندا گەر هەڵەم کرد لەسێدارە دەدرێم. دڵم بە یاریەکەوە نییە و خەم و خەفەت دایگرتووم. دیۆفێلی کوڕم بەدووری کەمتر لەدووپێ لە منەوە دانیشتووە و بەکاوەخۆ چاوەڕێ دەکات. منیش وەکو باوکێک

ناتوانم دەست بە قژە بژەکەیدا بهێنم کە وەکو دڕکێک وایە، ناتوانم دەست لە ملە خڕ و نەرموشلەکەی بدەم و لەشە گەرم و گورە باریکەکەی لەباوەش بگرم. ئەم حاڵەی کە من تێیدام ناتوانم بەهیچ وشە و نووسینێک دەری ببڕم. بارودۆخم زۆر ستەمکارانە، دڕندانە، قێزەون و ناخۆشە. لەناکاو بەرگەی لەمە زیاتر ناگرم و فرمێسک بە چاوانمدا جۆگەلە دەبەستێت و قوڕکیشم دەنگێکی گڕ و خشەخشێک دەردەکات و دیۆفێل ڕادەچلەکێنێت. مەترسە پیاوی بچووک، من خۆشم دەوێیت. کەمێک هێور دەبێتەوە و هێشتا بەدوای ئەوەوەیە یاریەکەم لێ بباتەوە. دوو پیتی تر دەڵێت و ئەو بردیەوە و منیش دۆڕاندم. لە سووچێکی لاپەڕەکەدا یەک یەک وێنەی قەنارە و پەت و پیاوە تاوانبارەکە دەکێشێت.

لەهەمان کاتدا سیلێست یاری کارتوێڵ دەکات. لەوانەیە میکانیزمێکی جێگرەوەی تواناکان هاتبێتە کایەوە، چونکە لەو کاتەوەی بەرزکردنەوەی پێڵوی چاوێک بۆ من وەکو بەرزکردنەوەی ئاسنێکی قورس وایە، لەو کاتەشەوە سیلێست بووە بە جومبازێکی بە توانا و لێهاتوو. وەکو پشیلەیەک تەقلە بۆ پشتەوە لێدەدات، لەسەر دەستەکانی دەوەستێت و چەندین تەقلەی تر - کە پێویستت بە ئازایەتیەکی زۆرە بۆ ئەنجامدانی — لێ دەدات. بەم تازەکیە ڕۆشتن لەسەر پەتیشتی کردووەتە ناو لیستی ئەو کارانەی کە خۆی داینەوە لە داهاتوودا بیانکات - بێگومان لە پاش مامۆستایی و مۆدێل و گوڵفرۆشی. هەموو سەرنجی ئەو ناوەی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە، بەرە بەرە لە تەقلە لێدانەوە دەست دەکات بە سەما کردن، ئەمیش لەبەر داخ لەدڵنانی دیۆفیلی برای کە لە هەموو شتێک زیاتر ڕقی لە

ڕاکێشانی سەرنجە بۆ لای خۆی. ئەوەندەی سێلێست بزێو و زیندووە، دیۆفیلیش هێندە شەرمن و داخراوە. جارێکیشیان لە تەواوی دڵیەوە ڕقی لەدڵ گرتم کاتێک لە مامۆستاکان مۆڵەتم وەرگرت بۆ ئەوەی یەکەم زەنگی تەواوبوونی وانەی پۆلەکەی ئەوان من لێی بدەم. هیچ کەس ناتوانێت پیشبینی ئەوە بکات ئایا دیۆفیل دڵخۆش دەبێت یان نا، بەڵام ئەوە شتێکی بێ شکە کە لەگەڵ چەند سێبەرێکدا دەژی.

بەلاماوە جێگای سەرسووڕمانە کە چۆن سێلێست زۆربەی گۆرانیەکانی هونەرمەندانی ساڵێ شەستەکانی لەبەرە. وەکو جۆنی هاڵیدەی، سیلڤیێ ڤارتان، شێیلا، کلۆ-کلۆ فرانچۆیس، فرانچۆیس هاردی، ئەمانە هەموویان ئەستێرەی سەردەمێکی زێڕینن. بێجگە لە هەندێ گۆرانی ناسراو و بەربڵاو لە جیهاندا، سێلێست گۆرانیگەلێک دەڵێت کە یادگاریەکانی پێشووت وەکو شتێکی بەرجەستە دەهێنێتەوە بەرچاو. لەتەمەنی پێش دوانزە ساڵیمدا بێ وەڕزبوون گۆرانیەکم دووبارە و دووبارە دەکردەوە، ئەویش گۆرانی کلۆ-کلۆ فرانچۆیس ٤٥-ڕپم "کچە دەوڵمەندە داماوەکە" بوو. کاتێ سێلێست بە دەنگی خۆی دەیڵێتەوە، هێشتاش تەواوی ئاواز، هەموو نۆت و ڕستەیەک، گشت وردەکاریەکی مۆزیسیان و ئۆرکێستراکە بە دەقیقیەکی تەواوەوە دێتەوە پێش چاوم. ڕێک وەکو هەوای ئەو دەریایەی چۆن بە ئاسانی دێت و سەرجەم زیندان و دەرگا داخراوەکانت بۆ دەکاتەوە. دووبارە بەرگی ئەلبوومەکە و وێنەی گۆرانیبێژەکە خۆی و جلە قۆپچاویەکانیم بیر دەکەوێتەوە. زۆرم حەز لە کراسێکی هەمان شێوەی کراسی گۆرانیبێژەکە بوو، بەڵام کراسێکی وا نەدەکرا بیکەمە بەرم، چونکە دایکم جلێکی وەهای بە

شڕ و دڕ دەزانی. تەنانەت دووبارە ئەو دوانیوەڕۆیەی ڕۆژی شەممە دەژیـــێمەوە کە چـــوم ئەلبـــوومەکەم کـــڕی. ئـــامۆزاکەی بـــاوکم دوکانێکی بچووکی گۆرانی لە خوارەوەی گاریێ-دو-نۆرد هەبوو. پیاوێکی زلی خوڵقخۆشبوو، هەمیشە جگەرەیەکی زەردی گایتانی بە لادەمەوە بـوو. گـۆرانیەکە دەڵـێت "کـچە دەوڵەمەنـدە دامـاوەکە، بەتەنیا ڕۆشتووە بۆ کەناردەریاکە، هەرچەندە دەوڵەمەندە بەڵام تەنهایە ....." .کات تێدەپەڕێت و مرۆڤەکانی جارانیش دیارنەمـاون. یەکەم کەس دایکم مـرد، دواتـر کلۆ-کلۆ فرانچێسـیش بە کارەبا ڕۆحـی دەرچـوو. دواتـریش ئـامۆزا نەرم و نیـانەکەی بـاوکم، دوای ئەوەی لە کارەکەی ئیفلاسی هێنا و سەرکەوتوو نەبوو مرد، لەدوای خۆشیەوە یەک هــۆز منــداڵ و یەک ڕەوە ئــاژەڵی بەجێهێشــتبوو. ئێســتا دۆڵابەکەم پڕیەتــی لە کراســی قــۆپچە قۆپچەیــاوی و وا بــزانم فرۆشگا بچووکەکەی خوارەوەش – کە پیشتر دووکـانی گـۆرانی فرۆشتنی ئامۆزاکەی باوکم بوو- سەرقاڵی فرۆشتنی شوکلاتەیە. شەمەندەفری بێرک دەڕواتەوە سەر ڕێگەی گاریێ-دو-نۆرد، واباشترە ئەمجارە داوا لە یەکێک بکەم هەواڵێکی ئەو گوزەرەم بۆ بهێنێت.

سـیلڤیێ بە دەنگێکـی بەرز وتـی "ئـافەرین سێلێسـت زۆر جـوانە" و دیـۆ فیلێش یەکسـەر وتـی "دایـکە تـاقەتم نەمـا". کاتژمـێر پێنجـی ئێـوارەیە و زەنگـی نەخۆشـخانەکە لـێ دەدات، زەنگێـک کە زۆربەی جار خۆشی و ئاسوودەییەکم دەکات بەبەردا، خۆشی و ئاسوودەییەک کە وام لـێ دەکـات پێشبینی کـاتی ماڵئـاوای خۆم بکەم لە کەسە نـامۆ و ئازیزەکـانم. وردە وردە بـایەکەش گسـکێک دەهێنێـت بە خۆڵەکەدا. شـەپۆلەکەش هێنـدە مەلەوانەکـانی بـردووە لەگەڵ خۆی

کە ئێستا وەکو نوقتەیەکی بچووک لە ئاست ئاسۆدا دەردەکەون. منداڵەکانمان دەچن تا کۆتا جار قاچی خۆیان بخەنە نێو ئاوەکە پێش ماڵئاوایی کردن. من و سیلڤیێش بێدەنگ و بەتەنها ماوینەتەوە و بە دەستی دەستە نەبزۆک و سڕەکانم دەگوشێت. لە پشتی چاویلکە ڕەشەکەیەوە کە وێنەی ئاسمانی بێکۆتا دەداتەوە، بە نەرمی فرمێسکەکانی بۆ ژیانی رابردوومان دەسڕێت.

لەگەڵ ئەواندا بۆ ژوورەکەم دەگەڕێمەوە تا ماڵئاوایی لەیەک بکەین. دیۆفێل دەڵێت "ئێستا هەست بە چی دەکەیت بابە گیان؟". قوڕگی باوکی دیۆفیل و سیلێست تەنگ و نووساوە، دەستەکانی لەبەر خۆرەکەدا ڕەش بوونەتەوە و قونیشی لەبەر ئەو ماوە زۆرە لەسەری دانیشتووە ئازاری دەدات. بەڵام لەکۆتاییدا ڕۆژێکی پڕ لە چەژ و خۆشی و ئاسوودەیی بەڕێکرد. ئەی ئێوە منداڵەکان، ئەی ئێوە دوای ئەم گەشتە کەمە چی لە ژیانی تەنهایی مندا بەجێدەهێڵن؟

کەوتوونەتە ڕێ و ئێستا بەرەو پاریس ڕێگایان گرتووەتەبەر. منیش بە قووڵی خەریکی تێڕامانم لەو نەخش و نیگارەی کە سیلێست هێنای و دەمودەست هەڵیواسی، وێنەی ماسیەکی دووسەری ڕەنگاورەنگی چاو پێڵو شین. ئەوەی بەلامەوە مایەی سەرسوڕمانە ڕەنگەکەی نییە، بەڵکو ئەو سەلیقە و وردیە یە کە لە کێشانی ئەم وێنەیەدا بەدی دەکەم، کە تا ڕادەیەک شێوەی نیشانەی بێکۆتای بیرکاری بۆ خۆی هەڵبژاردووە. خۆرەکەش لە پەنجەرەکەوە خۆی دەکات بە ژووردا. ئێستا ڕێک ئەو دەمانەیە کە تیشکەکانی لەسەر پشتیەکەم پەخشدەبێتەوە. لەبەر هەرا و زەناکەی دوێنێ بیرم چوو پێیان بڵێم

پەردەکانم بۆ دابخەن. بەس پێش کۆتایی هاتنی دنیا پەرستارێک دێت و بۆم دادەخات.

# پاریس

بە هێواشی کاڵ دەبمەوە و نامێنم. هەرچەندە پرۆسەکە بەخاوی دەڕوات، بەڵام ئەگەری ڕوودانی شتێکی بێ شک و گومانە. وەک چۆن دەریاوانێک تەمەشای ئەو بەندەرە دەکات کە لەدوای خۆی بەجێی هێشتووە، منیش تەماشای ڕابردووم دەکەم کە شێوەی دارێکی پایزانە و گەڵاکانی هەڵدەوەرێت. ژیانی پێشووم لە ناخەوە دەمسووتێنێت، وە زۆربەشی بووە بە سووتویەکی بێ ئەرزش.

لەو کاتەوەی نیشتەجێی ئەم زەنگۆڵە نووقووم بووەم، دوو گەشتی کورت و بچووکم بۆ شاری پاریس کردووە، بۆ ئەوەی ئەو بڕیارە لەسەر نەخۆشیەکەی خۆم بزانم کە لەسەرو خۆمەوە داویانە. لە یەکەم جاردا، دڵخۆشیەک لەناوەوەمدا سەری هەڵدا کاتێک ئەمبولانسەکەم تێپەڕی بەلای ئەو بینا مۆدێرنە بەرزە بێزراوەی کە بووبووم بە سەرنووسەری گۆڤارێکی ئافرەتان تێیدا. یەکەم شت کە ناسیمەوە باڵەخانەکەی بەرامبەری بوو، پاشماوەیساڵی شەستەکان بوو و بەپێی ئەو پارچەتەختەیەی پێوەی هەڵواسراوە دیارە دایانناوە بۆ ئەوەی بیڕوخێنن. دوای ئەوە ڕووکارە شوشەییەکەی دەرەوەی باڵەخانەی خۆمانم بینی، ڕووکارکارێک کە وێنەی هەر هەور و فڕۆکەیەک دەداتەوە کە بەوێدا تێپەڕ دەبێت. لەسەر شۆستەکەش ئەو دەموچاوانەم دەبینی کە دە ساڵە بەو ڕێگایەدا دێن و دەچن و هێشتاش ناویان نازانم. کاتێک بە ئەستەم کەسێک ناسروام بینی، ناسراوێک کە لەدوای ئافرەتێکی قژ تۆپەڵ و پیاوێکی چوارشانەوە ڕێی دەکرد، خەریکبوو سەری خۆم لە شوێنەکەی

بێنمە دەرەوە تا بیبینم. لەوانەیە کارمەندێکی خۆمان لە باڵەخانە شەش نهۆمیەکەوە ئەمبولانسەکەمی بینی بێت. خەڵکی وا هەست دەکەن چاوم لەخۆیەوە ئاو دەکات، بەڵام ئەو کاتەی بەلای کافێیەکدا تێپەڕبووین کە جاران هەرکاتێک برسیم بوایە دەهاتم و ژەمێک بەلەزەتم دەخوارد، فرمێسک بەچاومدا هاتە خوارەوە.

لە دووەم گەشتمدا بۆ پاریس - کە چوار مانگ دوای گەشتی یەکەم بوو - هیچ هەستێکی ئەوتۆم بۆ دروست نەبوو. جلە ئاڵ و واڵا هاوینەییەکان شەقامەکانیان تەنی بوو، بەس لای من هەر زستان بوو، وە ئەوەشی لە پەنجەرەی ئەمبولانسەکەوە بینیم لە تەماشاکردنی فیلمێک دەچوو. دەرهێنەرەکان پێی دەڵێن "کامێرای دواوە"، وەک چۆن ئۆتۆمۆبێلی پاڵەوانەکە بە خێرایی دەڕوات و دیمەنەکەی دواوەشی دەگۆڕێت، بەس ئەوەی لە ڕاستیدا دەڕوات دیمەنەکەیە نەک کەسەکە. کۆمپانیای هیچ-کۆک لە دیمەنە شاعیرانەکانیاندا زۆر قەرزاری ئەمجۆرە تاکتیکەن کە لە کۆندا بەکاریان دەهێنا. گەشتکردنم بە پاریسدا وەکو کەسێکی ئاسایی لێ کردمەوە. هەر وەکو جاران وابوو، لەسەر شەقامەکە ژنانی ماڵەوە بە عەزیەکی گوڵ گوڵاویەوە و تازەپێگەیشتوانیش بە سکەیتەکانیان ڕێیان دەکرد، هێشتا پاسە پڕ لە خەڵک و نامەبەرە جوێندەرەکانی لێمابوو، ئەو نامەبەرانەی سکۆتەرێکیان پێ بوو. دارەکانیش لەبەر بایەکە وەکو مەلەوانێکن کە بە سواری تەختەیەکەوە یاری لەگەڵ شەپۆلەکاندا دەکات. هەموو شتەکان وەکو خۆیان بوون و لەجێی خۆیان بوون، بێجگە لە من، من لە شوێنێکی دیکە بووم.

# سەوزە و ڕووەک

"ڕۆژی هەشتەمی مانگی جون، دەبێت بە شەشەم مانگی دەسپێکی ژیانە نوێیەکەم. نامەکانتان لەسەر مێزەکەیە، وێنە و نیگارەکانتان هەڵواسراوە بە دیوارەکەدا، بەهۆی ئەوەی ناتوانم وەڵامی هەمووتان بدەمەوە، هەوڵدەدەم ئەم نووسینانە بکەم بە ڕاپۆرت و بەیاننامەیەک لەسەر ژیان و ئاوات و حەز و خەونەکانم. یەکەمجار کە ڕووداوەکەم بەسەردا هات ڕەتم دەکردەوە هیچ شتێکم بەسەردا هاتبێت. کە تۆزێکیش دوای لەهۆشخۆچوونەکەم هاتمەوە سەرخۆم دەم وت دوای ماوەیەکی کەم دەگەڕێمەوە سەر شەقامەکانی پاریس، ئەوپەڕی بە دوو گۆچان یان بە دوو دارشەقەوە پیاسە دەکەم."

ئەوە یەکەم نامەی ئیمەیڵی مانگانەی من بوو کە لە نەخۆشخانەی بێرکەوە بۆم دەنووسین، لە کۆتایی بەهاریشدا بڕیارمدا بۆ هەموو هاوڕێ و هاوکارەکانمی بنێرم. یەکەم نامەم بۆ شەست کەس نارد، ئەو نامەیە وەرچەرخانێک و گۆڕانکاریەکی دروستکرد لەو دەنگۆ و باس و خواسانەی لەبارەی منەوە بڵاو بووبوونەوە. پاریسش کە سەد دەم و هەزار گوێی هەیە، ئاگای لە هیچ شتێک نییە و هەموو قسەیەکیش دەکات. دوای نامەکەم ئیتر پاریس لەخۆیەوە لەسەر من قسەی نەکرد. لە کافێ-دێ-فلۆر، ئەو شوێنەی کە بووەتە کامپێک بۆ پاریسیە لووتبەز و لەخۆباییەکان کە مقۆ مقۆ لەناو خەڵکیدا وەکو کۆترێکی نامەبەر دەیێننەوە، لەوێ هەندێ لە هاوڕێ

نزیکەکانم کردبویانە دەمەقاڵە لەگەڵیاندا. بوختانچییەکان وەکو داڵەکەرخۆرەیەک کە کەلاکی ئاسکێکی دۆزیبێتەوە ئاوها برسی و چڵێس بوون. یەکێکیان وتی "ئەزانیێ ئێستا باوبی بەس ڕووەک دەخوات و بووە بە ڕووەک خۆر؟" ئەوی تریش وتی "بەڵێ ئاگام لێیە، بووەتە ڕووەکخۆرێکی تەواو". دەبێت وشەی "ڕووەکخۆر" لە دەمە زۆرزانەکەیاندا چەند تامی خۆش بووبێت، لەوانەیە بەچەند جارێک لە گۆشتی بە پەنیر خۆشتر بووبێت. بە ئاوازی قسەکەیدا دیاربوو کە ئیدی من لە قاڵبی مرۆڤبوون دەرچووم و بوومەتە ڕووەکخۆرێک. فەرەنسا ئازادی زۆری دابوو بە دانیشتوانی، کەس نەیدەتوانی لەبەر بوختانێک یان هەواڵێکی خراپ تەقە لە هەڵگری هەواڵەکە بکات. لەبەر ئەوە ئەگەر سەربەخۆیانە کارێک بکەم دەبێت دڵنیا ببمەوە لەوەی ئایا هێشتا مێشکم ئەوەندەی توورێک کاردەکات یان نا.

ئەو گونجانەی کە هەر لە لەدایکبوونمەوە ئەویش لەگەڵمدا لەدایک بووبوو، بووبوە هۆکارێکی سەرەکی بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆشەویستانمدا بە سەلامەتی بمێنمەوە. وە فیز و لەخۆبایبوونەکەشم ئەنجامگەلێکی دڵخۆشکەری هەبوو. بێجگە لە هەندێ کەسی کەلەڕەق کە هەرگیز چاک نابنەوە و هەردەم بێدەنگن، ئەوانەی دی هەموویان دەزانن کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەتوانن سەردانم بکەن و لە زەنگۆڵە نووقومبووەکەمدا بۆ ماوەیەک بمێننەوە، ئەگەرچی هەندێ جاریش زەنگۆڵە نووقمووم بووەکەم دەمبات بۆ شوێنگەلێک کە خۆشم نازانم کوێن و تا ئەوکاتە پێیاندا نەڕۆشتووم.

هەندێ نـامەم بـۆ دێ کە هەر بەڕاسـتی جـێگەی تێڕامـانن وگرنگیەکی بەرچاویـان هەیە. نامەکـان بەڕوومـدا کـراوەن و هـیچ شتێکم لێناشارنەوە، نامەکان کاتەکەیان دیاریکراوە و وەکو ئەوەی بۆ ڕێوڕەسمێکی ئاینی ئامادەکرابێت. خۆم بە جوانی و بە وردی هەموو نامەکان دەخوێنمەوە. هەندێکیان شتی جددیان تێدا باسکراوە، باسی مانای ژیان، دووعا لە ڕۆحە گەورەکە، باسی نهێنی هەموو بوونێک دەکەن. جا ئەو کەسانەی کە ئاوا خۆیـان بە لێزان پیشان دەدەن ئەم پرسیارە جددی و بنەڕەتیانەم لێدەکەن، ئەو کەسانە بوون کە سووکە ناسینێکم هەبـووە لەگەڵیـانـدا. قسـە زلەکانیـان دیـوە ڕاسـتیەکەی نازیانی داپۆشیوە. باشە من کەڕ و کوێر و نەزان بووم، یان هەر دەبێت شـتێکی نـاخۆش بەسـەر کەسـەکاندا بێـت بـۆ ئەوەی ڕووە ڕاستەقینەکەیان پیشان بدەن.

نامەکانی دیش دەبێت کاتی خۆیان بێت تا مانای خۆیـان بەدەستەوە بـدەن. وەک: ئەو گـوڵانەی کە لە گزنگی بەیانیدا لـێ دەکرێنەوە، دڕندۆنگی یەکشممەیەکی باراناوی و منداڵێکی گرینۆکی خەواڵو. هەمـوو ئەم بەش و قاشـە بچووکـانەی ژیـان و گشـت ئەو شـنەی دڵخۆشی و خۆشەویستیە بچووکـانە لە هەمـوو شـتێکی دی زیـاتر قووڵدەبنەوە لە دڵ و یادەوەریەکانـدا. گەر نامەکـان دوو دێڕ، هەشـت پەڕ یان مۆرێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و گەرمابردووشی پێوە بێت، بۆ من شێوەی گەنجینەیەکن. دەمەوێت ڕۆژێک هەموویان بەیەکەوە ببەستمەوە، و بیدەم بەدەم باوە و بەدەم شەکانەوەیەوە مانای هاوڕێیەتی پیشانی خەڵکی بدەم.

## چوونەدەرەوە

گەرمیەکی خنکێنەرە، بەس هەر دەمەوێ بڕۆمە دەرەوە. ئەوە چەند هەفتەیەک و بگرە چەند مانگێکیش دەبێت لە خەستەخانەکە بۆ پیاسەی بەردەم کەنار دەریاکە نەڕۆشتوومەتە دەرەوە. کۆتاجار کە ژوورەکەی خۆمم بەجێهێڵا زستان بوو. لێشاوی بەفرەکە هەموو گردە لمینەکانی داپۆشی بوو و هەندێ عەرەبانەی منداڵانەش - بۆ مەبەستێک کە دەکرێت خۆیان بیزانن - لەبەردەم بایەکەدا دانرابوون. حەزدەکەم بێرک بە جلە هاوینەییەکانیەوە ببینم، دەمەوێت ئەو کەناردەریایە ببینم کە زستان بەتەواوی چۆڵ کرابوو، ئەو کەناردەریایەی لە مانگی جولایدا پڕبوو لە کەسی بێ ئیش و کەمتەرخەم. بۆ ئەوەی لە سۆرێلەوە بگەیتە سەر شەقامەکە دەبێت بە سێ گەراجدا تێپەڕیت، گەراجێک کە جادە بەرز و نزم و زبرەکەی بەهیلاکتدا دەبات. بێ سەرو بەری ئەو ڕێگەیەم لەبیر نەچووە. دەتوت وەکو تێگوشەیەک دروستکراوە، یەک دنیا چڵپاو و گۆماوی تێدابوو، تەنانەت چەند ئۆتۆمۆبێلێکیشی تێدابوو کە لەسەر شۆستەکە راگیرابوون.

لەکۆتایدا گەشتمە دەریاکە، چەتر و بەلەم و مەلەوانەکانی ئەوێ ئەو وەسفانەیان تەواودەکرد کە لە ڕیکلامەکەدا بۆی کرابوو. دەریایەکی نەرم و نیان و بێوەی، دەریایەک کە هەر دەڵێی بۆ گەشتکردن دروستکراوە. شەوقی پۆڵاکانی نێو نەخۆشخانەکەش هێندە بەهێز و

دیـارن ناکرێـت ئاماژەیـان پـێ نەکەم. هێشـتا دۆڵ و نشـێوەکان، هەڵاوڵساوی و تەمومژی ئاسۆی کەنارەدەریاکە وەکو خۆی وایە.

ڕێگەکەمان بەناو دارستانێکی پڕ لە پسکیتی دۆندرمەوە ڕانە سوور و بەلەزەتەکانـدایە. بەئاسـانی دەتـوانم وێنـای دڵـۆپەیەک ڤانێلا لە کچێکی گەنج و پێست ئەسمەربوودا بکەم، کە خۆ کەس ئاگای لە مـن نیـیە. چەنـد فێـراری لە مـۆنتی کـارلۆ هەیە هێنـدەی ئەو فێراریـانەش کورسـی پێچکـدار لە بێـرک هەیە، یەکێکـی دامـاو و بێچـارەی وەکـو مـنیش لە هەمـوو شـوێنێکدا هەیە. ئەم دوانیـوەڕۆیە کلاودێ – ئەو کەسەی کە ئەم کتێبەی لەگەڵدا دەنووسمەوە – و برایس لەگەڵمـدان. دوو هەفـتەیە کـلاودێ و بیست و پێنج ساڵیشـە برایس دەناسم. پێم نامۆیە کە برایسی، هاوتاوانە کۆنەکەم، باسی من بـۆ کـلاودێ دەکـات. باسـی زوو هەڵچـوونم و ئەو کتێبـانەی خۆشـمدەوێن و ئەو تەبـیعەتە کشمیشـیەم بـۆ خـواردن و سـەیارە بـێ سەقفەکەمی بۆ دەکات، باسی شتانێک دەکات کە ئێستا بوونیان نیـیە. وەکـو چیـرۆک گێـڕەوەیەکە کە گـۆڕی پاڵەوانـانی شارستانیەتێکی لەناوچوو هەڵبداتەوە. کلاودێ وتی" نەمدەزانی تۆ بەو شێوەیەیت!"ژیانی ئێستام بووە بە دوو بەشەوە، ئەوانەی کە پێشتر ناسیویانم و ئەوانەشی کە ئێستا دەمناسن. باشە تۆ بڵێیت کەسێک کە ئێسـتا دەمنـاسێ بچێت بەدوای ڕابردوومـدا بگەڕێت؟ خۆ مـن وێنەیەکی خۆمم پێ نییە تا پیشانیان بدەم کە کێ بووم.

لە پلیکانەی سەری سـەرەوەی قـادرمەیەک وەستاوین، لە خوارەوەش باری کەنارەدەریا و ڕیزێکی درێژ لە کـابینەی ڕەنگاو ڕەنگی لێیە.

قاردمەکان دەروازەی وێستگەی میترۆی پۆرتێ د'ئەوتێویلی پاریسی خستەوە بیرم. وا ڕاهاتبووم – کاتێک منداڵبووم - هەر ڕۆژێک لە مەلەوانگەی مۆلیتۆری کۆن هاتمەوە بەپەلە نە قادرمەکاندا هەڵبنزمە سەرەوە، چاویشم لەبەر گاریگەری کلۆراینی نێو ئاوەکە سوور سوور دەبوویەوە. چەند ساڵێک لەمەو پێش مەلەوانگەکە تێکدرابوو، وە ئێستا قادرمەکانیش وەکو شتێکی بێ بن وان بۆ من کە هەرگیز ناتوانم پیایاندا هەڵبزنمەوە.

برایس پرسیار دەکات "دەتەوێت بگەڕێتەوە؟". منیش ڕازی نابم و سەرم بە ئاماژەی نەخێر بە خوورتی دەجوڵێنمەوە. لەو کاتەوەی بەڕێکەوتین هەتا گەشتینە شوێنی مەبەست هیچ پرسیارێکم لێ نەکرا. بە خێرایی بەلای یاریەکی کۆنی چەرخ و فەلەکدا تێدەپەڕین، یاریەکی وێرانە کە دەنگە دەنگە ناقۆلاکەی دەڵێیت بە تەپڵی گوێمدا چەقیوە. بەلای کەسایەتیەکی ناسراوی نەخۆشخانەکەدا تێدەپەڕین، کەسایەتیەک بەناوی "فانگیۆ"، کەسێکی باڵابەرزی قژ قەترانی لەش وەرزشی. فانگیۆ وەکو دارێکی گەورە بەهێز و ڕەق وەستاوە. لەبەر ئەوەی ناتوانێت دابنیشێت، دەبێت هەمیشە بە ستونی یان ئاسۆیی بوەستێت. بەڕووی سکیدا بەسەر سوکانی چەماوەتەوە ئۆتۆمۆبێلەکەی بەخێرایی لێیدەخوڕێت، خەڵکەکەش بەدەنگێکی بەرز هاواردەکەن و دەڵێن "سەیرکە سەیرکە ئەوەتا فانگیو دێت!". دەزانم ئەو کێیە، بەڵام جار جار بەخۆم دەڵێم هەر بەڕاست ئەو کێیە؟ نازانم چی وەڵامی خۆم بدەمەوە. لەکۆتایدا دەگەین بە کۆتا خاڵی گەشتەکەمان، کە دەکاتە کۆتا خاڵی ئامانجەکەشمان. بەس بەڕاستی ئەوەندە سەرسامکەر بوو کە دەمم

بەدیار دیمەنی هەناسەبڕ و دڵڕفێنی دەریاکەوە داچەقابوو. هاتووم بۆ بۆنکردنی ئەو بۆنە خۆشەی کە لە کوخە سادەکانی لای کەناردەریاکەوە کزە بایەک لەگەڵ خۆیدا بۆ هێنام. کلاودێ و برایس لەبەر بایەکەدا ڕامدەوەستێنن. کوونە لووتەکانم خەریکە لە خۆشیدا شێت و هار دەبن کە ئەو هەوا بەهێزە دەچێتە ناویانەوە- هەرچەندە بۆم خراپە بەڵام ئەزموونێکە کە زۆربەی ئەوانەی دەژین ئەم دیمەنەی ژیان ئەزموون ناکەن. دەنگێکی بڵح و قێزەونیش لە پشتمەوە دێت و دەڵێت "ئۆههە، لەو بۆنە ناخۆشە!"

# بیست بە یەک

ئەوەتانێ، ئەوەتا گەڕایەوە بۆ لای خۆم. ئەو ئەسپەی ناوی میپرا-گراندچامب بوو.

دەبێت ئێستا ئیدی ڤینسنت لە ئابێڤێلێ وە بەڕێکەوتبێت. ئەگەر لە پاریسەوە دەستت بە گەشتەکەت کردووە، ئەوا زۆرت ماوە تا پێی بگەیت. هێشتا دوو ڕێگای گشتی سەرشار لە ترافیکی ئۆتۆمۆبێلت لە پێشە.

کاتی ڕوودانی ئەم چیرۆکە دە دانە ساڵ لەمەو پێشە، ئەو کاتەی من و ڤینسنت و هەندێکی دی خاوەنی پارە و سامانێکی زۆر بووین تا لە ڕۆژنامەکەماندا — کە هەموو ڕۆژێک دەردەچوو — خەرجی بکەین، ئەو ڕۆژمانەیەی دواتر نەما و لەناوچوو. خاوەنەکەشی - کە کەسێکی پیشەساز بوو، لەهەمان کاتیشدا شەیدایەکی سەرسەختی ناوبانگ و چوونە ناو هەواڵەکان بوو- ئەو کاتەی کە دەستە ڕەشەکانی نێو ئابووری و سیاسەتی پاریس ویستیان کۆنتڕۆڵی کارەکانی لەدەست بسەنن، ئەو ئەوەندە جەربەزە و ئازابوو کە منداڵەکەی ڕاسپارد بە نوێترین تیمی ڕۆژنامەوانی لە هەموو پاریسدا. بێ ئەوە بەخۆمان بزانین بووبووین بە کارتی دواتری ئەو، دەیتوانی هەرکاتێک بیەوێت بەکارمان بهێنێت، ئێمەش لە سەدا هەزار خۆمان فڕێدابوویە ناو ئاژاوەیەکەوە کە دەمانزانی دەربازبوون لێی قورسە.

لە ئێستادا ڤینسنت گەشتووەتە ئەو چوار ڕیانەی کە بەلای چەپیدا جادەکانی ڕۆوێن و کرۆتۆی دەخاتە پاش خۆی و لا دەداتەوە بۆ ئەو ڕێگا بچووکەی کە هەندێ شارۆچکەی بچووکی تێدایە و لە کۆتایدا دەگاتە بێرک. شۆفێرانێک کە ڕێگەکە شارەزا نین لەبەر پێچ و پەنا و سوڕانەوەکانی سەریان لێ تێکدەچێت و بزر دەبن. بەس لەبەر ئەوەی ڤینسنت چەند جارێک هاتووە بۆ لام ڕێگاکەی ون ناکات. ئەو لای وایە زانینی ئاڕاستەکانی گەیشتن بە کەسێک، نیشانەی هەبوونی دڵسۆزی و وەفاداریە بۆ ئەو کەسە.

حەوت ڕۆژ لە هەفتەیەکدا کارمان دەکرد. زوو دەهاتین بۆ سەر کار و درەنگانێکی شەو لەسەر کار دەچووینەوە. کۆتایی هەفتەش وچانمان وەرنەدەگرت و هەندێ جاریش تەواوی شەوەکە دەماینەوە، بەخۆشحاڵیەوە بە پێنج کەسەوە بەقەد یەک دەرزەن کارمەند کارمان دەکرد. ڤینسنت هەموو هەفتەیەک سێ جۆر بیرۆکەی هەبوو: سێی ناوازە، پێنجی باش و دوو دانەی پێکەنیناویش. بەشێکی ئیشەکەی من ئەوە بوو زۆری لێ بکەم تا لەناو ئەو بیرۆکەیانەیدا باشترینەکان هەڵ ببژێرێت، هەندێ جاریش بەم کارەم تووڕە و نائارام دەبوو. ئەو دەیویست بە باش و خراپەوە کار لەسەر هەر هەموویان بکات.

ئێستە هەست بە هاتنی ڤینسنت دەکەم، کە چۆن دووکەڵی جگەرەکەی سووکانی ئۆتۆبێلەکەی شاردوەتەوە و جوێن بە ڕێگاوبانی خەستەخانەکە دەدات. لە دوو ساڵی داهاتوودا ڕێگا گشتیەکەش دەگاتە بێرک، بەس ئێستا ڕێگای بێرک پڕیەتی لە بینا و باڵەخانەی تەواونەکراو، هەر بەلایدا بڕۆی هەست بەو شتە

دەکەیت، لەبەر ئەو هەموو شۆفڵ و گەڵابە و بلدۆزەی ئەو ناوەیان داگیرکرووە.

دوو کەسی لە یەک جیانەکراوە بووین، هەموو شتێکمان بەیەکەوە بوو، ژیانمان، خواردنمان، خواردنەوەمان، خەوتمان و بگرە هەردووکیشمان لێبڕاوانە بۆ ڕۆژنامەکە کارمان دەکرد، هەموو خەونمان ئەوە بوو ڕۆژنامەکە بەرەوپێشەوە ببەین. بیرۆکەی پێشبڕکێی ئەسپ سواریەکەی ئەم دوانیوەڕۆیە هی کێ بوو؟ یەکشەممەیەکی سارد و وشک و سامال بوو، ئەسپەکانیش لە ڤینسێنێس غاریان دەدا. کەسمان حەزێکی ئەوتۆمان لە پێشبڕکێی ئەسپسواری نەبوو، بەڵام خاوەنی پێشبڕکێکە ئەوەندەی دروستبوونی حەزی ئێمە بۆ پێشبڕکێکە ڕێزی لێگرتین، بانگهێشتی کردین بۆ ژەمی نیوەڕۆ لە ڤینسێنێس، وە زانیاریەکی زۆر گەورەی پێداین- زانیاریەک کە دەمانتوانی دێوەکەی عەلائەدین لە قۆریەکەی بهێنینە دەرەوە . پێی وتین کە بەدڵنیایە دەتوانێت گرەنتی ئەوە بکات میپرا- گراندچامب پێشبڕکێکە دەباتەوە، وە ڕێژەی قازانجەکان لەسەری بیست بە یەک بوو، هەرچەندە خێرێکی بچووک و لەهەمان کاتیشدا چەور بوو، بەڵام لە پارەی تەرخانکراو بۆ خزمەتکردنی مولکە گشتیەکانی ئەوناوە زیاتر بوو.

ئێستا ڤینسنت لە قەراغەکانی نەخۆشخانەی بێرک نزیک دەبێتەوە وەکو هەموو سەردانکەرێکی تر پێی عەجیبە کە ئیشی چییە لێرە!

ئەو ڕۆژەی ڕۆشتین بۆ پێشبڕکێکە نانێکی خۆش و بەلەزەتمان خوارد. هۆڵی نانخواردنەکە پڕ بوو لە کەسی گانگستەر و

شەقاوەچی، سەرشار بوو لە کەسی چاکەت و بۆنیبخاخ لەبەر، گەواد، ئەو کەسانەی کە بە بارمتە لە زیندان هێنراونەتە دەرەوە و کەسانێکی دی کە بەس لە خۆیان دێت بەژداری لە پێشبڕکێکەدا بکەن. تێر و پڕ نانمان خواردبوو، دوو بە دوو سیگارمان دەکێشا و لە چاوەڕوانی پێشبڕکێی چوارەمدا بووین. لەو جەوەدا کە لە جەوی خانویەکی پلاستیکی دەچوو، تاوانبارەکان وەکو گوڵێک کە خۆری بەرە بەیان لێیان بدات بەو شێوەیە شکۆفەیان دەکرد.

هەر کە گەشتە بەردەم دەریاکە ڤینسنت ئاڕاستەی خۆی بەرەو هاوینەهەواری نەخۆشخانەکە گۆڕی. ئەو ئاپۆڕایە هاوینەییەی کە سەردانیکەرانی نەخۆشخانەکە دروستیان کردووە زستانە سارد و چۆڵ و هۆڵەکەی لەبیری ڤینسنت دەباتەوە.

مانەوەکەمان لە هۆڵی نانخواردنی ڤینسێنێس ئەوەندە درێژەی کێشا کە پێشبڕکێکە دەستی پێکردبوو و تەواویش بووبوو. ئەو کەسەی گرەوی پێشبڕکێکەی بەڕێوەدەبرد یەکسەر پارەی بردنەوەکەی داینێ پێش ئەوەی لیستی ناوی ئەو کەسانەی بدەمێ کە پسوولەکانی خۆیان بەمن سپاردبوو. ناوی میپرا- گراندچامب لەسەر هەموو ڕۆژنامەکان بوو، باس و خواسەکان کردبوویانە گیانەوەرێکی ئەفسانەیی و هەموو کەس دەیویست گرەوی لەسەر بکات. دەبوایە دابنیشین و تەنها هیوای ئەوە بخوازین پێش ئەسپەکانی دیکە بکەوێت، لە کۆتا خولدا، پێشی ئەوانی دی کەوت. هەموومان بە تاس و زەوقەوە چاوەڕێی ئەوە بووین بگاتە خاڵی کۆتایی، وەکو بڵێی خەوێک بێت بینیمان کە چل یارد دووەم ئەسپی خسبوویە دوای

خۆی و خاڵی کۆتایی بڕی. دەبێت ئەوانەشی کە لە تەلەڤیزۆنەوە تەماشایان کردووە لەخۆشیاندا شوێنیان بەخۆیان نەگرتبێت.

ڤینسنت ئۆتۆمبێلکەی لە گەراجەکە ڕادەگرێت. خۆرەتاوێکی ئێجگار خۆشە. ئیدی لەوێوە شوێنێکە کە ئەو سەردانیکەرانەی لە ترسدا دڵیان هاتووەتە نێو دەمیان، غیرەتێک بدەنە بەر خۆیان و بێنە ئەو شوێنەی کە منی لە جیهانەکەی ئەوان جودا کردووەتەوە. دەبێت بە دەرگا شووشەییەکەدا تێپەڕن، بچنە بەرزکەرەوەی ژمارە حەوت و لەوێوە بە هۆڵە تەنگ و ناخۆشەکەدا گوزەر بکەن و بێنە ژووری ١١٩. هەموو ئەوەی لە دەلاقەی نیوە-کراوەی دەرگاکانەوە دەیبینیت ئەو کەسە داماو و بێچارانەیە کە لەسەر قەرەوێڵە کەوتوون و چارەنووسیش هەتا کۆتا خاڵەکانی مردن بردوونی. لەوانەیە هەندێکیشیان پێش ئەوەی بێنە ژوورەوە لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەمدا بوەستن بۆ ئەوەی لەوێوە بە چاوێکی وشکتر و دەنگێکی ڕوونتر سڵاوم لێ بکەن. هەر دێنە ژوورەوە ئیدی هەناسەبڕکێیان تێدەکەوێت وەکو ئەو مەلەوانانەی کە لەژێر ئاودان و بتڵی ئۆکسجینەکەیان خاڵی بووەتەوە. هەندێکیشیان دەزانم کە هەر بە هاتنیان کلکیان کردە ناوگەڵیان و ڕایانکردەوە بۆ پاریس، چارەسەری ئەو جۆرە مرۆڤانە ئەوەیە هەر لێرە نەجاتم بوو منیش بەجێیان بهێڵم.

ڤینسنت لە دەرگاکە دەدات و بە بێدەنگی و ئەسپایی دێتە ژوورەوە. هێندە بە دەم و چاوی ئەو سەردانیکەرانەم ڕاهاتووم کە ئیدی بەدەگمەن تووشی ترسێکی کەم عومریش دەبم. ئیتر بە هەر جۆرێکی تریش بێت من ئەوەندە ناترسم و کاریگەریم لەسەر دروست نابێت.

دەمەوێت ئەو هەستە سیس و پوکاوەبووانەی کەسە ئیفلیجەکان بنووسم، هیواداریشم ئەم نووسینە وا بکات لە کەسانی دی کە دێنە ژوورەوە هیچ نەبێت زەردەخەنەیەکمان بەرامبەر بکەن. ڤینسنتیش ئەم هەستە ناخۆش و ددان جیڕکردنەوەیەی من بە ماچێکی سەر تەوێڵم وەڵام دەداتەوە. قژە سوورەکەی، دەربڕینە تووڕە و مۆنەکەی، لەشە کورتە بن و خەپانەکەی و خووی ڕانەوەستانی لەسەر یەک قاچ و بەردەوام گۆڕیانیان وەکو گارسۆنێکی چێشتخانەی گۆشت بە پەنیری لێکردووە کە هاتبێت بۆ سەردانی هاوڕێەکی کرێکاری کە لە تەقینەوەی کانەخەڵوزێکدا هەپروون هەپروون بووە. ڤینسنت شێوەی یاریزانێکی بۆکسێن کە بۆ بردنەوەی خەڵاتێک یاری دەکات دێتە پێشەوە بۆ لام. لە ڕۆژی پێشبڕکێی ئەسپەکەشدا دوای بردنەوە وێنانەکراو و عەجیبەکە ئەو زۆر بە سادەیی لەژێر لێوەوە ووتی "گێژینە! ئێمە زۆر گەلحۆین! کە گەڕاینەوە بۆ ئۆفیسەکەمان ئێمە دەچینە مێژووەوە!" ئەوە ئەو شێوازە دەبڕینە بوو کە زۆری حەز لێبوو.

ڕاستی بڵێم، میپرا- گراندچامبم بیرچووەتەوە. یادەوەریەکانی ئەو پێشبڕکێیە هاتەوە یادم، بەڵام یادگارییەکان دووجار ئازارم دەدەن ، یەکەم لەبەر حەسترەم بۆ ئەو ژیانەی پێشووم و، دووەمیش پەشیمانیم بۆ ئەو دەرفەتانەی پێشتر بەهەندم وەرنەگرتوون. میپرا- گراندچامب ئەو ئافرەتە بوو کە نەماندەتوانی خۆشمان بووێت، ئەو هەلە بوو کە نەمانتوانی بەهەند وەری بگرین و ئەو کاتە خۆشانەش بوو کە ڕێگەمان دان ئاوا هەر بە ئاسانی لێمان دووربکەونەوە. ئەمڕۆ وام لێ دیارە کە ژیانم لە دەزوویەک لە دۆڕان و لەدەستدان پێکهاتووە:

ژیانمان پێشبڕکێیەکە کە پێش دەستپێکردنی ئەنجامەکەی دەزانین، بەڵام ناتوانین براوەکەی دیاری بکەین. هەر بەو بۆنەیەشەوە توانیمان پارەی هاوکارەکانمان بگەڕێنینەوە.

لەسـەروو ئەو هەمـوو ناخۆشـی و کێشـانەی تووشـم بـووە بەهـۆی نەخۆشیەکەمەوە، هەستی بیستنم هەر زۆر خراپی لێ بەسەر هاتووە. گـوێی ڕاسـتم هـیچ شـتێک نابیسـتێت و ئەو ئـامێرەی لە گـوێی چەپمدایە هەر دەنگێک لە دە پێ دوورتر بێت بەجوانی نایگەیەنێت و تێکـی دەدات. کاتێـک فـڕۆکەیەک بەسـەر پـارکی یـاریەکەی نەخۆشخانەکەدا دەڕوات وەکو ئەوە وایە ئاشێکی گەنم ڕێک بخەنە نێو تەپڵێ گوێمەوە، بەس خوا بەوە ڕەحمی کردووە کە دەنگەکە زوو نامێنێت و فڕۆکەکە بەخێرایی دەڕوات. لە دەنگی فڕۆکە ناخۆشتر، ئەو دەنگە دەنگەی دەرەوەیە، کە کەسانی دی دێنە ژوورەوە و بیریان دەچێت دەرگاکە لەدوای خۆیان دابخەن، هەرچەندە هەموو هەوڵێکی خۆم دەدەم بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکەمەوە دەرگاکە دابخەن. تەقەی پێڵاوەکانیان لەسەر زەوی نەخۆشخانەکە، هەر عەرەبانەیە و دەکێشێت بە عەرەبانەیەکی تردا، کارمەندەکانی نێو خەستەخانەکە وەکو ئەوەی لەنـاو بـازاڕدابن یەکـدی بانـگ دەکەن، ئەو ڕادیۆیـانەی کە کەس گوێیـان بـۆ ناگرێت هەمیشـە داگیرساون و لە هەمووشـی زیـاتر ئەو جیڕە جیڕەی زەوی نەخۆشخانەکەیە کە مێشکمی بردووە. هەندێک نەخۆشـی ترسێنەر و تـۆقێنەری لـێ بـوو. هەنـدێک دەزانـم لەوەتەی لەوێن گوێ لە یەک کاسێتی ڕادیۆ دەگرن و قەتاوقەت تاقەتیان لێـی ناچێـت. یەکێکـی دی دەناسـم کە نەخۆشـێکی زۆر گەنـجە، مراویەکی لە قەیفە دروستکراویان داوەتێ کە ئامێری کەشفکردنی

تێدایە. جارێکیان دەنگێکی مراوی هێندە بەرز و تیژی لێهات خەریبوو گوێم بتەقێ- ڕۆژی بیست و پێنج جار دەنگێکی لەو شێوەیە دەردەکات کاتێک یەکێک دێتە ژوورەکەیەوە. ئەو گەنجە زۆر بەبەخت بوو، چونکە پێش ئەوەی پلان دابنێم بۆ ئەوەی مراویەکەی تێک و پێک بشکێنم بردیانەوە ماڵەوە. نەخشە و پلانەکەم لە حاڵەتی ئامادەباشیدا دادەنێم، لەبەر ئەوەی: هەرگیز ناتوانیت بزانیت کە خێزانی ئەم گەنجە نەخۆشە چەند فرمێسکیان بۆ نەخۆشەکەیان ڕشتووە. بەس ئەوەی شایەنی خەڵاتکردنە ئەو ئافرەتەیە کە دوای لە هۆش خۆچوونەکەی تووشی شێتی بووبوو. قەپی لە پەرستارەکان دەگرت، جووتە گونی تیمارپێچە پیاوەکانی دەگرت، تەنانەت ئەگەر داوای پەرداخە ئاوێکیشی بکردایە دەیقیراند و دەیوت"ئاگرم تێبەربووو ئاوم بدەنێ ئاوو!" یەکەم جار هەر کاتێک هاواری بکردایە پەرستارەکان بەدەمیەوە دەچوون دەیان وت نەکا تووشی شتێک بووبێت، بەس دوایی لە بارودۆخەکە تێگەیشتن و وازیان لێدەهێنا بۆخۆی شەو و ڕۆژ هەر هاوار بکات. بانگ و قیرەقیرەکەی قاوشی نەخۆشیە دەماریەکەی ئێمەی وەکو شێتخانەیەک لێ کردبوو، بەس کۆتا جاریش پێم ناخۆش بوو کە لە لای ئێمەوە بردیانە قاوشێکی دی بۆ ئەوەی لەوێ هاواربکات و بڵێت "یارمەتیی، هاتوون بمکوژن!!"

دوور لەو قاو و قیژە کاتێک بێدەنگی دووبارە زاڵ دەبێتەوە بەسەر جەوەکەدا، ئەوکات گوێ لە پەپوولەکان دەگرم، ئەو پەپوولانەی لە مێشکمدا لە شەقەی باڵ دەدەن. ئەگەر یەکێک بیەوێت گوێی لێ بێت، ئەوا دەبێت زۆر ئارام و بێدەنگ بێت و جوان جوانیش ئاگادار

بێت، لەبەر ئەوەی ئەو دەنگە ناسکانەی لە باڵیانەوە دەردەچێت بە دەگمەن دەبیسترێن. هەناسەدانێکی بەرزت بەسە بۆ ئەوەی دەنگەکان بڕاکێنێت. زۆر سەرسامکەرە، هەتا بێت باری بیستم خراپتر دەبێت، هەتا باری بیستنیشم خراپتر بێت باشتر گوێم لە پەپوولەکان دەبێت، تۆ بڵێی من و پەپوولە یەک جۆر گوێمان هەبێت؟

لە پەنجەرەکەوە تەماشای باڵەخانە پرتەقاڵیەکانی نەخۆشخانە دەکەم، باڵەخانەگەلێک کە یەکەم تیشکی ڕۆژ لێیان دەدات و دەدرەوشێنەوە. شێوازی دانانی ڕەنگی پەمەیی خشتەکانیش ڕێک لەو شێوازە یۆنانیە دەچێت کە لە قۆناغی دواناوەندیدا خوێندومە. بەخۆم ئەوەندە کەسێکی گاریگەر بە هونەری یۆنانیەکان نەبووم، بەڵام ئەو ڕەنگ و شێوازە گەرم و گووڕ و جوانەیانم کەیف پێ دێت. وەکو ئەوەی جادویەکم لێ بکات هەتا ئێستاش حەز دەکەم زانیاری زیاتریان لەبارەوە بەدەست بخەم، بۆ نمونە خوێندنەوەی توێژینەوەیەک کە باس لە سەگەکانی ئالسیبیادێس و پاڵەوانەکانی پێرمەۆپیلایەکانی دەکات. ئەو ڕەنگە لەناو فرۆشیارەکاندا پێی دەوترێت "پەمەیی ئەنتیکە" یان " پەمەیی کۆن". ئەو ڕەنگەی لە پێشتردا لای یۆنانیەکان بەکار دەهات هیچ پەیوەندی بە ڕەنگی خشتە پەشمەک ڕەنگەکانی هۆڵی خەستەخانەکەوە نییە. زیاتر لە خشتەکان دەگونجێت، بەس هیچ لەو چوارچێوە بنەوشەییەی ژوورەکەی من ناچێت، وەکو ئەو بەرگە بێ ئەرزشی دەکات کە بۆ پێچانەوەی عەترە هەرزانەکان بەکاریدەهێنن.

یەکشەممە. زراوم لە یەکشەممە چووە، لەبەر ئەوەی گەر ئەو ڕۆژە سەردانیکەرم نەیەت، نازانم ئەو هەموو کاتە بەچی بکوژم. هیچ پزیشکێک و تیمارپێچیێک نایەت بۆ لام، هەر کەس نایەت

دەرزیەکیشم لێ بدات. یەکشەممە شێوەی بیابانێکی فراوان و نەبڕاوەیە، بیابانێک کە مێرگەکەی تەنها شۆردنێکی بە ئیسفنج بێت، ئەو شۆردنەش وەکو ئەوە وایە بەزۆر پێیان بکەن و لە گۆڵی خۆیانی بکەنەوە. یەکشەممان پەرستار و برینپێچەکانی خەستەخانەکە پێیان ناکرێت لەکاتی خۆیدا بێن بۆ سەر کارەکەیان، لەبەر ئەوەی شەوی شەممە ئەوەندە هیلاک بوون، ئەوەندەیان خەم و ئارەق خواردووەتەوە کە چۆن سەیرانێکی خێزانیان لەدەست داوە، کە چۆن نەچوون بۆ بازاڕ و بۆچی پێش یەکشەممە نەڕۆشتوون بۆ ڕاوە ماسی. ئەو ڕاهێنانەی نێو ئاوەکە، کە وا دەکات چارەسەرەکەم خێراتر بێت، جیاوازیەکی ئەو تۆی نییە لەگەڵ ئەوەی وێنەم بکێشرێت، هێندە خاو و خلیچکە، جا لە بێ سوودیەکەشی بگەڕێ. ئەو هەموو بۆنە خۆشەی لێم دەدەن بەهیچ جۆرێک توانای لابردنی دەمامکە ڕاستەقینەکەمی نییە، چونکە هەر چۆنێک بێت دوای ماوەیەک بۆنم ناخۆشم دەبێت، گەر یەکێک نەمناسێت وا دەزانێت ڕزیوم.

لە یەکشەممان‌دا ئەگەر تەلەڤیزیۆنەکە داگیرسابێت، دەبێت پێشوەختە خرابێتە سەر بەرنامەیەکی خۆش، چونکە گەر بەرنامەکە بەدڵم نەبێت، دەبێت لە بەیانییەوە هەتا شێوان گوێی بدەمێ. ئەگەری یەکێکش بێت و کەناڵەکەم بۆ بگۆڕێت، دەبێت هیچ نەبێت سێ بۆ چوار کاتژمێر چاوەڕێی بکەم تا دەگاتە لام. هەندێک جاریش دەبێت دڵ بەو بەرنامە چێژبەخشانە خۆش نەکەیت کە لە دوایەوە ئۆپێرایەک، یان هەر بەرنامەیەکی تری ناخۆش و مێشک ئاوڵسێنەر دێت. ئەو چەپڵە دەنگبەرزانەی بۆ کەسە سەرکەوتووەکانی لێدەدەن ئازار بە گوێیەکانم دەگەیەنێت. لەجیاتی ئەوانە حەزم بە

بەرنامەیەکی بەڵگەنامەییە لەسەر هونەر، مێژوو یان ئاژەڵان. بەبێ دەنگ تەماشایان دەکەم، چونکە دەنگیان ناگاتە گوێم، ڕێک وەکو ئەوەی لە دوورەوە تەمەشای ژیلەمۆکانی ناو شوێنێکی گڕگرتوو بکەیت.

لە یەکشەمماندا، زەنگەکەش بێ ئیش بێ ئیش کاتژمێرەکان بەڕێ دەکات. ڕۆژ ژمێری نەخۆشخانەکە یەک یەک ڕۆژەکان قووت دەدات و دەڵێت ئیدی مانگی ئۆگەستە. کات پارادۆکسێکی زۆر نهێنی و پڕ ڕازە، چونکە لەم نەخۆشخانەیەدا جووڵەی نییە و بە هیچ ناڕوات، بەڵام لە دەرەوەی ئێرە غار دەدات و بە کەس ناگیرێتەوە. لە جیهانی مندا کاتژمێرەکان دەبێت ڕایان بکێشیت هەتا تێپەڕ ببن و مانگەکانیش بەبێ پرسی کەس دێت و دەچێت. باوەڕ ناکەم گەشتبمە مانگی ئۆگەست. هاوڕێکانم و ماڵ و منداڵەکانیان خۆیان داوەتە بەر ئەو بایە خۆشەی هاوینی ئێرە. لە مێشکی خۆمدا دەچمە ناو گەشتە و خۆشە هاوینەییەکەیان – کێشەم نییە ئەگەر دڵخۆشی ئەوان دڵتەنگم بکات. لە بریتانیا، کۆمەڵە منداڵێک بە پاسکیلەوە لە مارکێتێکەوە دەچنەوە بۆ ماڵی خۆیان، دەموچاوە دڵخۆشەکەیان هەر لە دوورەوە دیارە. هەندێ لەو منداڵانە دەمێکە باس و خواسی هەرزەکاری دەزانن و فێربوون، بەڵام ئەوەی لای شەقامی برێتۆنەوە پیاسەیەک بکات، شەقامێک کە پڕیەتی لە گوڵ و گوڵزار، ئەوە بۆ جارێکی دی هەست بە منداڵبوونەوە و هیچ نەزانی خۆی دەکات. ئەم دوانیـــــــوەڕۆیە بە بەلەم بەدەوری دوورگەکەدا دەســــــوڕێنەوە، بەلەمەکەیشیان بە پێچەوانەی ئاڕاستەی شەپۆلەکانەوە دەڕوات. هەر یەکێک دەبێت لە بەلەمەکەدا بە ئیسراحەت بۆخۆی دانیشتبێت و

چاوی داخستبێت و قاچەکانی خستبێتە ناو ئاوی فێنکی دەریاکەوە. لە باشووری فەڕەنسا ئەوەندە گەرمە خوا خوای ئەوەتە خانویەک یان سێبەرێک بدۆزیتەوە و خۆت لە گەرما پڕووکێنەکەی قوتار بکەیت. لەو کاتانەدا دەفتەرۆنەکەت بە ڕەنگی ئاوی دەنەخشێنیت. پشیلەیەکی بچووکی قاچ شکاو لە باخچەی قەشەکەدا بەدوای سێبەرێکدا دەگەڕێت، هەندێک ئەولاتر، لە دەشتێکی تەختی ئەم وڵاتەدا، هۆردوویەک گا بەناو زۆنگاوێکدا دەڕۆن و ئەوەی لەدوای خۆیان بەجێیدەهێڵن بۆنی تووۆی ڕازیانەیە. لە سەرانسەری وڵاتدا هەموو خەڵک سەرقاڵی ئاهەنگ و بۆنە ناوخۆییەکانن. لە کۆتایشدا، دەزانم هەموو دایکەکان لە ئامادەکردنی بێزارن، بەڵام بۆ من ئەوبەڕی گرنگیدانی ئەو بە من دەگەیەنێت، ئەو دیارییەش بریتییە لە نانی نیوەڕوان.

لە یەکشەممەدا، لە کتێبەکانم ڕادەمێنم، ئەو کتێبانەی کە لەسەر تاقی پەنجەرەکە بۆیان داناوم تا وەکو کتێبخانەیەک دەربکەوێت، کتێبانێکی بێسوودن، بەو هۆیەوە لەمڕۆدا کەس کاتی بەفیڕۆ نادات و نایەت بۆ لام و بۆمی بخوێنێتەوە. سێنێکا، زۆلا، چاتێوبریاند، ڤالێری لاربـاود لە ڕیـزی ئەو کتێبـانەن، بەس سێ پێ لێمەوە دوورن، بەڵام هەرگیز ناتوانم دووبارە بیانگرمەوە دەستەکانم. مێشێکی گەورەی ڕەش لەسەر لووتم نیشووەتەوە. سەرم تۆزە تۆزە دەجوڵێنم تا بیفڕێنم، بەڵام ئەو پێیە بچکۆلەکانی لەسەر لووتم دەچەقێنێت و پێگەی خۆی قایم دەکات. زۆرانبازی لە چاو ئەم حاڵەی من و ئەم مێشە هەر زۆر ئاسانترە.

ئیدی یەکشەممەکان ئاوایە بۆ من.

# خانمەکانی هۆنگ کۆنگ

حەزم لە گەشتکردنە. بە خۆشحاڵییەوە ئەوەندە وێنە و بۆن و خۆشیم زەخیرەکردووە لە ژیانی پێشوومدا، ئێستا هەر کاتێک بمەوێت لە بیرک دەچمە دەرەوە، ئەو کاتانە بیرک بەجێدێڵم کە ئاسمانەکەی سەرم هیچ شتێکی بۆ جێنەهێلاوم جگە لە مانەوەم لێرەدا. ئەو شوێنانەی من لە مێشکمدا سەردانیان دەکەم زۆر نامۆن: وەکو ئەو بۆنە ترشەی کە لە بارێکی نیویۆرک دێت. بۆنی عەترە فەقیرانەیەی کە لە مارکێتێکی ڕانگون دێت. منداڵە ساواکانی نێو ئەم دنیایە. شەوە کڕێوەبارانەکانی سەینت پیترسبۆرگ و خۆرە تواوە و گەرمەکەی بیابانی ناڤادا. ئەم هەفتەیە کەمێک تایبەت بوو. هەموو کازیوەیەکی سبەینان گەشتەکەم بەرەو هۆنگ کۆنگ دەست پێدەکات، لەوێ کۆنفرانسێکیان ڕێکخستووە بۆ گۆڤارەکەم. تێبینی ئەوە بکە کە دەڵێم "گۆڤارەکەی من" هەرچەندە مانای وشەکە بە شێوەیەکی دی دەگات، وەک بڵێیت ئەو جێناوە خۆییە تەنها پەیوەندی من بێت بەم ژیانەوە.

لە هەندێ کێشەم لە ڕێگەی هۆنگ گۆنگدا هەیە، ئەم شارە چینیە وەکو ئەو شوێنانەی دی نییە کە پێشووتر سەفەرم بۆی کردووە، چونکە لە ژیانی ڕاستیمدا قەت سەردانی ئەم شارە نەکردووە. هەر کاتێک کە دەرفەتی ڕۆشتنم بۆ ئەوێ بۆ هەڵکەوتووە، چارەنووسێکی سیخناخ لە تووڕەیی و قین نەیهێلاوە بگەم بە

ئامانجەکەم. ئەگەر لە شەوی پێش کۆچەکەمدا نەخۆش نەکەوتمایە – کە هەموو جارێک نەخۆش دەکەوتم – ئەوا یان پەساپۆرتەکەم لێ ون دەبوو، یان بەڵگەنامەکانم بۆ شوێنێکی تر دەنێردران. بە کورتی و پوختی، هەر جارێک ویستبێتم لە سنووری وڵاتەکەی خۆم دەربچم یەکسەر بەخت پشتی تێکردووم و بووە بە دوژمنم. جارێکیان جێگەکەی خۆمم دا بە جین پاوڵ.ک، ئەوکاتە پێش ئەوە بوو لەلایەن حیزبوڵاوە بە بارمتە بگیرێت. ویستبووی چەند ساڵێک لە زیندانە ژێرزەمینیەکەی بەیروتدا بمێنێتەوە، وە لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا بۆ هەمیشە یادی قاوە بەلەزەتەکانی بۆردۆ بکاتەو، تا لە تەنیایدا شێت نەبێت. لە گەڕانەوەکەی هۆنگ کۆنگیدا مۆبایلێکی بێ وایەری بۆ هێنامەوە، ئەو کات مۆبایلێکی بێ وایەر داهێنانێکی نوێ بوو. ئەو چاوە دڵخۆشانەی پشت چاویلکەکەیم بەبیر دێتەوە. زۆر کەیفم بە جین پاوڵ دەهات، بەس دوای ئازادبوونی لە بەیروت هەرگیز بۆ جارێکی دی نەمبینیەوە. زۆر شەرمەزار بووم کە من سەرنووسەری گۆڤارێکی ئاوا بووم و ئەویش هەموو بە هەموو هەوڵ و تەقەلای خۆیەوە، بە ژیانی خۆی سەرکێشی کرد لەپێناو ئەو گۆڤارەکەیدا. ئێستاش من زیندانیم و ئەویش کەسێکی ئازادە. جا لەبەر ئەوەی من دووعا یان سروودێکی ئاینی ئامادەکراوم لەبەردەست نییە هەتا بیخوێنم، بۆیە دەبوایە خۆم بە شتێکی دیکەوە سەرقاڵ بکەم. دەبوایە لە بێ ئیشیدا بیرم لەوە بکردایەتەوە گۆڤارەکەم لە چەند وڵاتدا لە چاپ دەدرێت. ئەوەندەی بیرم بێت بیست و نۆ ڕێوڕەسمی یەکێتی نەتەوەیی گۆڤارەکەم لە چاپ دا.

ئەی ئێستا ئەو هەموو هاوکار و هاوپیشەیانەم لە کوێن؟ هەموو ئەو هاوڕێیانەی کە وەکو نوێنەری باڵوێزخانەیەکی فەرەنسی بەرامبەر جیهان کاریان دەکرد لە کوێن؟ لە ژووری کۆنفرانسی هۆتێلە نێودەوڵەتیەکان دەوەستان و هەموو کارێکیان ئەوە بوو بە کە چەند وەڵامێک بە زمانەکانی چینی، ئینگلیزی، تایلەندی، پرتوگالی و چیکی ئامادە بکەن هەتا وەڵامی ئەو پرسیارانە میتافیزیکیانە بدەنەوە کە لێیان دەکردا، وەکو: ئافرەتێکی ئاسایی ئێلیٚ چۆنە؟ یان کێیە ئەو ئافرەتە ئاساییەی ئێلیٚ؟ لە مێشکمدا وا دەیان هێنمە پێش چاوم کە لە هۆنگ گۆنگ پیاسە دەکەن و بەژێر ئەو فرۆشگا گڵۆپ نیۆنانەدا دەڕۆن کە کۆمپیتەری بچووکی باخەڵی و سوپی سپاگێتی لیٚ دەفرۆشرێت، هەر وەکو سەربازێکی گوێقوڵاخ دوای بەڕێوبەری هەمیشە قات و ڕیبات لەبەر کەوتوون. بەڕێوبەری نیوە کریانۆ و نیوە بۆناپارتیٚ، تەنها لەپێش باڵەخانە هەوربڕەکاندا ڕۆشتنەکەی خاو دەکاتەوە و بە شێوەیەکیش تەماشای باڵەخانەکان دەکات وەک بڵێی ئێستا بە یەک قەپاڵە حەپەلووشیان دەکات.

بە کام ڕێگادا بڕۆین سەرۆک؟ بچین بە ڕێگای هایدرۆفۆیڵ و قوومارخانەکەی ماکاو دا، یان ڕێگای فلێکس بارەکەی پێنسولا بگرینەبەر کە لەلایەن دیزاینەر فەڕانسی فیلیپ.س وە نەخشەی بۆ کێشراوە؟ هەر لە خۆوە بەشە لەخۆبابییەکەی ناخم دووەم هەڵبژاردەی پیٚ خۆشە. لە ڕاستیدا حەزم لە دانیشتنی سەر کورسیەکی شکۆمەندە، وە حەزدەکەم تەماشای ئەو کەسانە بکەم کە دێن و سوود لە شکۆمەندیەکەم وەردەگرن. منێک کە هیچ کەیفم بەوە نایەت وێنەم بگیرێت، لە دەستەبژێری ئەو پاریسیانەین کە خۆمان

وێنەی فیلیپ.س دەکێشین، بەڵام هەرچی دەکەین ناتوانین کاری دیزاینەکەی وەکو خۆی بکەین. ئەو وێنەیە، پێش ئەو چەند هەفتەیە گیرا کە هێشتا چارەنووس نەیکردبووم بە داهۆڵێک تا قەلەڕەشەکان زراویان لێم بچێت. نازانم گەر کورسیەکەم زۆر یان کەم بەناوبانگ بێت لای خەڵکی، بەس ئەگەر رۆشتیشی بۆ ئەوێ بیکە لەرێی خوا بە مەیگێڕەکە مەڵێ کە ئێستا حاڵم چۆنە و چیم بەسەر هاتووە. دەڵێن چینیەکان چارەنووسی کەسانی دی دەزانن، دەی ئەگەر ئەم حاڵەی ئێستای منیان پێشتر بزانیایە ئەوا هیچ کام لە کچە جوانە نیو تەنورەلەپێکانی چین نەیدەوێرا لێم نزیک ببێتەوە.

# نامەکە

هەرچەنـــدە ژوورەکەی مـــن لە ســـەرجەم ژوورەکـــانی دیـــکەی نەخۆشخانەکە جیاوازە و وەکو خوێندنگەیەکی نموونەیی گرانبەهایە، بەڵام هیچ کاتێک کەسێک قەرەباڵغیەکەی نێو کافتریاکە - بە هەڵەش بێت - بە ئەنـدامانی دێـد پـۆێتس سۆسایتی (کۆمەڵگای شاعیرە مردووەکان) نازانێت. کچەکان بە لاچاوێکەوە تەماشا دەکەن و کوڕەکانیش لەشیان تاتۆ و هەندێ جاریش پەنجەیان ئەنگوستیلەی تێدایە. لە کافیتێریـاکە دەدانیشـن و بەدەم جـگەرە کێشـانەوە - کە دووکەڵەکەی ئەو نـاوەی کـردووە بە دارسـتانێکی گڕگـتو - باسی شـەڕە لاکۆڵانەکـان و مـاتۆڕ و ئەو شـتانە دەکەن. دەڵێی بە شـانە چەمـاوە و بێ هێزەکانیـان خاچیـان هەڵگرتـووە. نازانم چارەنووس بەو شێوەیە لێکـردوون، یـان هەر خۆیـان بەو شـێوەیەن، بەڵام مانەوەیـان لە بێـرک قۆنـاغێکە لە منـداڵیە بـێ دەرەتـانی و ناچیزەکەیـانەوە بـۆ داهاتوویەکی بێ ئـیش و کـار. کاتێـک بە کورسیە پێچکدارەکەم بەویـادا تێـپەڕدەبم لەجیـاتی ئەوەی بێـدەنگ بـن زیـاتر دەنـگ بەرزدەکەنەوە، هـیچ بەزەیـی و هەسـت و سـۆزێک لە چاویانـدا بەدی ناکەم.

لە پەنجەرە کراوەکەی کافتریاکەوە گوێت لە دڵی نەخۆشخانەکەیە، دڵێـک کە چوارجـار لە کاتژمێرێکـدا زەنـگە قەشـەنگەکەی لـێ دەدات. لەسـەر مێـزەکەی بەردەمیـان هەر کـوپی بەتـاڵە و پڕاوە بەو

ناوەدا، ئامێرێکی تایپکردنی بچووکیشی لێیە کە لە جیاتی کاغەزی سپی، کاغەزی پەمەیی تێدایە. هەرچەندە ئێستا پەڕەکە هیچی لێ نەنووسراوە، بەڵام وا باوەڕم بەخۆم هێناوە کە ڕۆژێک کەسێ دێت و نامەیەکم بۆ دەنووسێت، چاوەڕوانم...!

# له مۆزەخانەی مۆمەکە

دوێنێ شەو لە خەومدا سەردانی مۆزێ گریڤینم کرد، مۆزەخانەی مۆمی پاریسشی پێ دەڵێن. دەروازکەی هەر وەکو خۆی بوو، دەروازەیەک کە بە ستایلی نوێ دانراوە، پەنجەرە و ژوورەکانی هەر وەکو جاران ناخۆش و خزمەتنەکراو بوون، گەلەریەکەش ڕەونەق و دڵڕفێنی جارانی نەمابوو. لە ژوورەکانی یەکەمدا، کەسایەتیە لە پەیکەر دروستکراوەکانی ئەوێ هەموو جلی بازاڕیان لەبەردابوو، هیچیانم بەباشی نەناسیەوە هەتا پۆشاکی نەخۆشخانەکەم نەکردەوە بەریان. دوای تێگەشتم کە ئەم کوڕ و کچە نیو تەنوورە لەپێیانە، ئەم ژنەی کە قۆری چایەکە بە دەستیەوە وشک بووە و کوڕەی کڵاوی ئاسنین لەسەر لەڕاستیدا هەر ئەو کەسانە بوون کە شەو و ڕۆژ لە پێخەفەکەی تەنیشتمدا بوون. هەموویان لەوێ ئامادەبوون، بە شیلەی مۆم توونند بە زەویەکەوە نووسێندرابوون. جۆرە کەسانێکی نەرم و نیان، دڵڕەق و توند، خەمۆر و بێ خەم، ماندوونەناس و تەمبەڵیان تێدابوو. کەسانێک کە دەتوانیت پەیوەندی لەگەڵیاندا دروست بکەیت، کەسانێک کە بۆ ئەوان لە نەخۆشێک زیاتر هیچی دیکە نیت.

یەکەمجار لە هەندێ ئەندامی ستافەکە تۆقی بووم. وەکو هاوزیندان و هاوتاوانێکی ئەم چارەنووسە ناخۆشەی خۆم تەماشام دەکردن. دوایی ڕقم بەرامبەر هەندێکیان لەدڵ گرت، ڕقم لەوانە دەبووەوە کە قۆڵیان چەماندمەوە کاتێک خستمیانە سەر کورسیە پێچکدارەکە،

ئەوانەی تەلەڤیزۆنەکەیان هەتا بەیانی بە کراوەیی بەجێدەهێڵا و ئەوانەشی ئاگاداری حاڵی ناخۆشی من نەبوون سەرەڕای ئەو هەموو نارەزایییەشم. لەو کاتەدا لە تووڕەیدا گەرم بووبووم بە کوشتنیان زۆر خۆشحاڵ دەبووم. بەڵام بە تێپەڕبوونی کات تووڕەییەکەم دامرکایەوە و باشتر ناسیمن. زۆر بە باشی ئەرکە ناسکەکەی خۆیان بەجێدەهێنا، ئەم هەمـوو خەمخواردنەشیان بـۆ ئەوە بـوو بـاری سەرشـانمان کەمەکێک سووک بکەن لەکاتێکدا ئێمە خاچێکمان بە شانەوە بوو.

نازناوم بۆ هەموویان دانا، نازناوانێک کە تەنها خۆم دەمزانی. بۆیە هەرکاتێک بهاتنـایەتە ژوورەوە لە نـاخی خۆمـدا دەموەستاندن و دەم وت: "هێی تۆ، چاو شین، بەیانیت باش،" بەس ئەم هاوارکردنەی من هیچی لە بارودۆخەکە نەدەگۆڕی، چونکە ئەوان بە هیچ شێوەیەک ئاگایان لە یەک پیتیش نەبوو. پرۆفیسۆر دەیڤد بۆوی بە دەوری جێخەوەکەمدا سەما دەکات و بە پۆزێکیشەوە دەڵێت "چۆنی باشی، ئێستا حاڵت چۆنە؟". پێشگری "پرۆفیسۆر"ی پێش ناوەکەی دەمخاتە پێکەنـی. بە دەموچـاوە منـداڵ ئاسـا و قـژە مـاش و بـرنجیەکەیەوە قسـەگەلێک لەدەمـی دێـتە دەرەوە کە پێـی وایە ئەو دادگـایی مـن بکات، نمونەیەکیش لەو دادگایی کردنانە ئەو کاتەیە کە دەڵێت "تا ئێستا زۆر باش هاتووی." ناتوانیت بیر لە کەسانێکی شێوەی ڕامبۆ و ئارنۆڵند بکەیتەوە وەکو کەسانێکی میهرەبان و بەسۆز. پرۆفیسۆر کارەکەی زۆر بەباشی بەڕێوە دەبات ئەگەر جار جار گەرمییپێوەکەی لە بەینی بنباڵمدا – کە بۆ پێوانی گەرمی لەشم بەکاری دەهێنێت – بەجێ نەهێڵێت.

لە خەوەکەمدا پەیکەرتاشی مۆزەخانەکە بە تەواوی سەرکەوتوو نەبوو لە کێشان و دروستکردنی ئەو مۆرە و خەندەیانەی کە ڕۆژانە لەسەر سیمای کارمەندانی نەخۆشخانەکە بوون. ئەو کارمەندە باکووریانەی کە هەر لە باو و باپیرانیانەوە لە نێوان کەنارەکانی کاناڵ و کێڵگەکانی پیکاردیدا ژیانیان بەسەربردووە. ئەوان کە هەر کاتێک بە تەنها بن ئیدی دەگۆڕێن و لەو کەسە ناچن کە پێشتر هاوڕێ لەگەڵ کەسانی تردا بینیومن. بۆ ئەوەی بە ڕاستی و تەواوی لێیان تێبگەیت دەبێت بەهرەیەکی وەک وێنەکێشێکی یەکجار وورد و بەتوانات هەبێت کە دەتوانێت بە جادوویەک هەموو قەرەباڵغیەی ناو شەقامەکانی فلاندەر دروست بکات. وێنەکێشەکەی لای ئێمە بەهرەیەکی لەو جۆرەی نییە. بەڵام هێشتا توانیویەتی ئەو پەرستارە کەمئەزموونانەی کە کولمیان لە ئاڵیدا ڕەنگێکی پەمەیی دەنوێنێت و چاڵێکی پەری ئاساش لە ڕوومەتیاندایە، ببات بۆ خۆی. هەر کە ژوورەکەم بەجێهێشت، هەستمکرد کە من ئەو ئازاردەرانەی خۆمم زۆر خوشدەوێت.

کە چوومە پێشانگای دووەمەوە سەرم زۆر سووڕما. چونکە ڕێک ژوورێکی کۆپیکراوی خۆم بە هەمان وردیەوە بینی، دواتر بۆم دەرکەوت ژووی ۱۱۹مینی نەخۆشخانەکەیە. بەس کە تۆزێک نزیکبوومەوە، دیتم هەموو ئەو وێنە و نەخش و نیگارانەی کە بە دیوارەکەوە هەڵواسراون هەمان ڕەنگ نین لەگەڵ ئەوانەی ئێستادا، وەک بڵێیت کاڵبوونەوەیەکیان بەسەردا هاتبێت. وێنەکان تەنها لە دوورەوە جوان و ڕەونەقدا و کاریگەر بوون. لە پێخەفەکەدا کەسی لێ نەبوو، جگە لە بۆشاییەک کە لە ناوەڕاستی چەرچەفە زەرد و

بێرەنگەکاندا دیار نەمابوو. دواتریش هیچ کێشەیەکم بۆ دروست نەبوو لە ناسینەوەی ئەو کەسانەدا کە یەکسەر دوای ڕووداوەکە وەکو پاسەوانی تایبەتیم لە پاڵمدا وەستابوون.

میشێل لەسەر کورسیەکە دانیشتووە و بە وریای لەو تیانووسەدا دەنووسێت کە سەردانیکەرانم لەکاتی هاتنیان بۆلام شتی تێدا دەنووسن. ئانێ ماری یەک باوەش گوڵم - کە لە چل دانە پێکهاتووە- بۆ دێنێ. بێرناریش یادەوری ژیانێک لە قسەزانی لە دەستێکیدا و لەسەر ڕوخساریشی ئەو دەبڕینە نەم و نیانە هەبوو کە کتومت لە داومیێر دەچوو. چاویلەکەکەشی - کە بە ئەستەم بە لووتیەوە گیرسابوویەوە - شێوەیەکی تەواوی وتاربێژی ناو دادگای پێ بەخشیبوو. فلۆرێنس وێنە و نیگاری کێشراوی منداڵەکان لەسەر تەختەی دیوارەکەدا جێگیر دەکات، قژە ڕەشەکەشی لە زەردەخەنەیەکی مات و خەمبار دەچێت. پاتریکیش، کە شانی بە دیوارەکەوە نووساندووە، لە بیرکردنەوەدا ڕۆچووە. هەر کە نەرم و نیانیەکەی ئەوانم دیت، وتم دووبارە دێمەوە ژیان، بۆ ئەوەی قەرەبووتان بۆ بکەمەوە. بوون بە هاوبەشی خەمەکانم، سۆز و میهرەبانیەکیان بەجێهێشت هەرکاتێک هاوڕێیەکی تریش دێت بەبۆنەی ئەوانەوە هەست بە خۆشی و ئارامی دەکەم.

ویستم درێژە بە گەشتەکەم بدەم لەناو مۆزەخانەکدا، بۆ ئەوەی بزانم چ سوپرایزێکی تری بۆ هەڵگرتووم، لە ناکاو پاسەوانی هۆڵە تاریک و نووتەکەکە لایتەکەی دەستی هەڵکرد. دەبوایە چاوم بە قاییمی دابخەم. کاتێک خەبەرم بوویەوە بینیم پەرستارێک بە دەست و

مەچەکێکی خڕ و خەپانەوە بەسەر مندا چەمابووەوە بە پێنووسەکەی دەستیەوە و وتی " ئەوە حەبی خەوە. ئێستا دەتەوێت یان کاتژمێرێکی دی بێمەوە؟"

## دروستکەری ئەفسانە

لە قوتابخانە لەسەر کورسیەک دانیشتبووم، ئەو کورسیەی کە هەردوو پانتۆڵەکەم لەسەری شڕ و دڕ کرد - ئەوەندە لەسەری دادەنیشتم - لەوێ لەگەڵ کوڕێکی لەڕ و لاواز و دەموچاو سووردا یەکمان ناسی، کوڕەکە ناوی ئۆلیڤەر بوو. ئۆلیڤەر کەسێک بوو کە لە مێشکیدا ئەفسانەی دروست دەکرد، ئەمەش وای دەکرد کە هاوڕێیەتی لەگەڵیدا قورس بێت. هاوڕێکانی ئۆلیڤەر خۆشترین و نەرم و شلترین قەنەفە و کورسیان لەماڵەوە هەبوو، جا دەڵێی ڕێک بۆ ئەوە دروستکراوە لەسەریان دابنیشیت و تەماشای فیلم بکەیت. لە دووشەمەدا دەهات و بە حیکمەت و ژیریەکەی - کە لە ئەفسانەی هەزار و یەک شەوە دەری هێنابوو - سەراسیمەی دەکردین. ئەگەر یەکشممەیەکیش لەگەڵ جۆنی هاڵیدەدا نەبوایە، ئەوە ئیتر دەبێت خۆمان بزانین کە چووە بۆ لەندەن بۆ ئەوەی تەماشای نوێترین فلیمی جەیمن بۆند بکات، یان ئەو ڕۆژەی بە لێخوڕینی جوانترین و نوێترین هۆنداوە بەسەربردووە - هۆندا جۆرە ماتۆڕ سکیلێک بوو کە هەموو کات و هەموو کەس لە قوتابخانەکە باسیان دەکرد و لە فەڕەنساش شتێکی نوێ بوو. لە بەیانیەوە هەتا شێوان ئەم هاوڕێیەمان درۆی بچووک بچووک و بێشەرمانە قسەی ناشرین و بڵحی هەڵدەبەست، بەبێ شکانەوە چیرۆک لەدوای چیرۆک دەیگێڕایەوە، هەرچەندە چیرۆکەکانی ئێستای ئەوانەی پێشتریان بەدرۆ دەخستەوە. بە جۆرێک بوو کە لە کاتژمێر دەی بەیانیدا هەتیو و بێکەس بوو، لە

نیوەڕۆدا خۆی دەکرد بە کوڕە تاقانەی ماڵێک و دوای نیوەڕۆش دەیتوانی ببێت بە برای دوو دەستە خوشک کە یەکێکیان پاڵەوانی خلیسکێنەی سەر بەفرە و ئەوی دیکەشیان خوێندکاری ئەندازیاریە. باوکیشی - کە کارمەندێکی شارستانی بوو - بە قسەی خۆی دروستکەری بۆمبی ئەتۆمی بوو، هەر ڕۆژێک بەپێی مەزاجی کوڕەکەی دەبوو بە شتێک کە خۆشی هەواڵی لێ نییە، ڕۆژێک دەیکرد بە بەڕێوبەری دەستە مۆزیسیانی گروپی بیتڵس و دواتریش کوڕە نەناسراوەکەی فەرماندە گاولێ. لەگەڵ ئەوەی ئۆلیڤەر دیقەتی جوانی نەدەدایە ئەو درۆیانەی کە بۆ ئێمەی دەکرد، ئێمەش هەرگیز باوەڕمان پێ نەدەکرد. هەر کاتێک درۆیەکی نا ئاسایی و شاخداری بکردایە ئێمە دەمانوت کە باوەڕت پێ ناکەین، ئیدی ئەویش بەرگری لەخۆی دەکرد و دەیوت "سوێند دەخۆم کە ڕاست دەکەم،" ئیدی بەو قسەیە ئێمەی دەمکوت دەکرد.

دواتر کە زیاتر بارودۆخەکەم پشکنی، بۆم دەرکەوت کە ئۆلیڤەر نە فڕۆکەوانە، نە سیخوڕی دەزگایەکی گەورەی جیهانیە، نە دەستەڕاستی ئەمیر و سوڵتانێکی ئەم دنیایەیە. دەیویست لە جیهانی ڕیکلامکردنەکەی خۆیدا گوڵە سیس بووەکانی بچێنێت.

نابێت خۆم بەڕەوشتر لە ئۆلیڤەر بزانم، لە ئێستادا بەخیلی بەو بەهرەیەی دەبەم کە هەر چیرۆکێکی بویستایە دروستی دەکرد. هەرچەندە دڵنیاش نیم کە بەهرەیەکی وام پێدەدرێ یان نا، بەڵام هەوڵدەدەم چارەنووسی ڕووداوەکانی ناو ژیان بگۆڕم. هەندێک جار دەبم بە شۆفێری فۆرمولا وەن، دڵنیام کە ئۆتۆمۆبێلە

گرگرتووەکەمت لە گۆڕەپانی مۆنزا یان سیلڤەر ستۆن بینیوە. پێشبڕکێکارە سپیە بێ ناو و ژمارە و ڕیکلامەکە منم. لەسەر جێخەوەکەم ڕاکشاوم، بۆ ئەم سووچ و ئەو سووچ پەلەقاژە دەکەم. کڵاوەکەش سەرمی زۆر قورس کردووە و لە هەموو لایەکیشەوە زەوی بێ ڕەحمانە بۆلای خۆیم ڕادەکێشێت. لە ڕۆڵێکی دیکەمدا یەکێک بووم لە بەشداربوانی زنجیرەیەکی تەلەفیزیۆنی، کە ڕۆڵی سەربازێکم لە جەنگێکی مێژوویدا دەگێڕا. شانبەشانی ڤێسێژیتویس دژی قەیسەر جەنگاوم، پشتی جولەکەکانمان لە پۆیتییێرس شکاند، یارمەتی ناپۆلیۆمان دا لە سەرکەوتنەکەیدا و لە شەڕی ڤێردووندا نەجاتمان بوو. هەرچەندە لە شەڕی دی-دەیدا برینداربووم، بەس ناتوانم بەڵێنی ئەوە بدەم لە دیێن-بیێن-فودا دەتوانم بەشدار بم یاخود نا. لە چاوی ڕاهێنەرەکەمەوە ، ئەوەندەی بەرزی بورجی پاریس دوورم لەوەی سەرکەوتن لەم جەنگەدا بەدەست بهێنم. سەرکەوتن ماسولکە بەئازارەکانم هێور دەکاتەوە و کەمێک ئارامیان پێ دەبەخشێت. من یاریزانێکی خلیسکێنەی بێ وێنەم. هێشتا گوێم دەنگ و هاوارەکانی هاندەرەکانمە. هێشتا وا هەست دەکەن بایەکە لەناو گوێمدا گۆرانی دەڵێت. سوێند دەخۆم کە زۆر لەپێش یاریزانە بەتواناکانی دیکەوە بووم.

## ڕۆژێک لە ژیانی دنیا

ئیدی بەرە بەرە خەریکە دەگەینە کۆتایی ڕێگاکە، ئەم کۆتاییەش لە هەینیە کارەساتبارەکەوە دەستی پێکرد، ٨ ی دیسێمبەر، ١٩٩٥. لە دەسپێکی کتێبەکەمەوە، هەمیشە ویستوومە لە کۆتا ساتەکانی ژیانمدا ساغ و سەلامەت بم وەکو هەر بوونەوەرێکی تری سەر زەوی هەر لەسەر ئەو بارەش بمرم. بەڵام دەبێت ئیتر ماڵئاوایی لەو ویستەشم بکەم، وەک چۆن ماڵئاوایم لە چەندین حەز و ئارەزووی دیکە کرد. چونکە لە کاتی تەماشاکردنی ژیانی ڕابردوومدا لە ناکاو هەست بە گێژبوون و لە هۆش خۆچوونێک دەکەم. چۆن دەتوانم یادی ئەو کاتژمێرانە بکەمەوە کە هەر وەکو دڵۆپەی جیوەی ناو گەرمی پێوێکی فێڵباز و خەڵەتێنەر بوون. ئەی چۆن دەتوانم وەسفی کۆتا جار بکەم کە لەتەنیشت ژنێکدا خەبەرم بوویەوە؟ ژنێکی بێئاگا، تۆزێک مڕ و مۆچ و گازندەکەر، ئێجگار تەمبەڵ و خاوەنی باڵەیەکی بەرز و قژێکی قەترانی. ئەو ڕۆژە ئاسمان ڕەنگێکی خۆڵەمێشی دەنواند، پاریس و خەڵکەکەشی بێدەنگ بوون، وەک بڵێیت دەستیان لە کارەکەیان کێشابێتەوە. من و فلۆرێنیش وەکو هەموو پاریسیەک، چاومان هیچی نەدەبینی و ڕەنگمان پەڕی بوو. وەکو زۆمبیەک دەستمان بەو ڕۆژە سزادەرە نەناسراوە کرد، سزایەک کە بەهۆی مانگرتنێکەوە دروستبوو بوو. ئەو ڕۆژە بە کارانێک هەستام کە خۆم حەزم لێیان بوو. ڕدێنم تاشی، ڕێک و پێک خۆمم گۆڕی و شوکلاتەیەکی گەرمیشم خواردەوە، وەک بڵێی ڕۆژی دواتر ناتوانم

هەمان ئەو کارانە ئەنجام بدەمەوە. چەند هەفتەیەک پێشتر، ئەمڕۆم دانابوو بۆ ئەوەی نوێترین جۆری ئۆتۆمۆبێلی ئەڵمانی تاقیبکەمەوە، وە خاوەن بازرگانیەکەش ئەو ڕۆژە ئۆتۆمۆبێلێک و شۆفێرەکەی خستبووەیە خزمەتی من. لە کاتی دیاریکراودا، گەنجێک کە هەر وەکو بازرگانێک جلوبەرگی پۆشی بوو لە دەرەوە شانی لەسەر بی ئێم دەبلیویەکی گەن میتاڵی ڕەساسی دانابوو. لە پەنجەرەی باڵەخانەکەوە تەماشای ئۆتۆمۆبێلە کۆنەکەم دەکرد، لەو سەرەوە زۆر بە بەهێزی دەردەکەوت، ڕەنگەکەی هەر وەکو جاران بوو. لە مێشکی بیردەکەمەوە و دەڵێم داخۆ ئەو چاکەتە لێڤیە کۆنەم لەناو ئەو ئۆتۆمۆبێلە کەشخەیەدا چۆن دەردەکەوێت؟ ناوچاوم نا بە پەنجەرەکەوە تا بزانم جەوی دەرەوە چۆنە. فلۆرێنس بە نەرمی بە کێشای بە پشتە ملمدا. ماڵئاواییەکی خێرا و لێویشمان بە ئەستەم بەیەکدا خشاند. بەسەر قادرمەکاندا بەخێرایی دەڕۆمە خوارەوە و بۆنی پۆڵیشی سەر قادرمەکان دەهات. ئەو بۆنە دەبێتە کۆتا بۆنی ژیانی پێشووم.

هەواڵەکانی ئەمڕۆ دەخوێنمەوە، ئەهبرااا!.....

لەنێوان ئەو ڕاپۆرتانەی باسی قەیرانەکەی دەکرد، ڕادیۆکە گۆرانی گرووپی بیتڵیسی لێ دەدا بەناوی "ڕۆژێک لە ژیانی دنیا". بی ئێم دەبلیوەکە وەک فەرشەکەی عەلائەددین وا خەریکی فڕینە و بەلای بۆیس دێ بۆولۆگن دەڕوات. لەناویشەوە دنیایەکی پڕ لە فەخامەت و گرانبەهایی و ئاسوودەیی دروست کردووە. شۆفێرەکەم کەسێکی خۆشخوڵقە. باسی ئەو پلانانەی دوانیوەڕۆی بۆ دەکەم کە بەتەمام

بیانکەم، لە پلانمدایە بچم کوڕەکەم لای دایکی بهێنمەوە، کە بیست و پێنج میل لە پاریسەوە دوورە و دەمەوێت لە سەرەتاکانی شەویشدا بگەینەوە پاریس.

تێبینی ئەوەی نەکردبوو کە لایتەکان گۆڕاوە.....

لە مانگی جولایەوە کە ماڵەوەم بەجێهێڵاوە، من و دیۆفیلی کوڕم وەکو دوو پیاو یاخود دوو مرۆڤ کە خۆشەویستیەک بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە، قسەمان نەکردووە. دامناوە پێکەوە تەماشای شانۆگەری فیلیپ ئاریاس بکەین، دواتریش لەوێوە بچین لە ڕێستۆرانتی پاریس کلیشێ و لەوێندەر ڕۆبیان بخۆین. پلان بۆ هەموو شتێک دانراوە، پێکەوە ئەم کۆتایی هەفتەیە بەسەر دەبەین. تەنها ئاواتم ئەوەیە مانگرتنەکە پلانەکەی ئێمە تێک نەدات.

دەمەوێت چێژ و خۆشیت پێ ببەخشم...

زۆر حەزم لەو کاتانەیە کە هەموو مۆزیسیانەکانی ئۆرکێسترا بە دەنگێکی بەرز موزیک دەژەنن و دەوەستن هەتا کۆتا مۆزیکی هەژێنەری خۆیان پێشکەشی ئامادەبوانیان بکەن، وەکو دەنگی ئەو پیانۆیەی کە لە باڵەخانەیەکی حەوت نهۆمیەوە بکەوێتە خوارەوە. گەشتینە لێڤالۆیس. بی ئێم دەبلیوەکە لە دەرەوەی ئۆفیسەکەم دەوەستێت، دەبێت کاتژمێر سێ بێتەوە بەدوامدا.

تەنها یەک نامە لەسەر مێزەکەمە، بەڵام چ نامەیەک!! دەبێت بە زووترین کات وەڵامی بدەمەوە، لەبەر ئەوەی نامەی سایمۆن ڤیە، ئەو ئافرەتەی کە وەزیری پێشووی تەندروستی بوو، ماوەیەکیش

بەناوبانگترین ئافرەتی فەرەنسا بوو، خاوەنی ژیانێک بوو کە بەردەوام لەناو کەسە سەرکەوتووەکانی ناو گۆڤارەکاندا بوو. ئەم جۆرە نامانە بە دەگمەن دێن، دەبێت پێش وەڵامدانەوە پرسیاری ئەوە بکەم کە چیم کردووە هەتا کەسێکی بەمشێوەیە گرنگ نامەی بۆ ناردبم. یاریدەدەرەکەم دەڵێت "لەوانەیە دڵتەنگ بێت بەو وێنەیەی کە لە کۆتا چاوپێکەوتنەدا پێکەوە چرکاندمان". خێرا بەنێو پەیوەندیەکانی نێوانماندا دەگەڕێم، وێنەیەک دەدۆزمەوە کە لەجیاتی ئەوەی ئەم کەسە - کە هەندێ کەس وەکو خودایەک دەپەرستن - زیاتر بەرزبکاتەوە و پیرۆزی بکات، کەچی بە پێچەوانەوە گاڵتەی پێ دەکات. ئەو وێنەیە یەکێکە لە نهێنیەکانی نێوانمان. ئەگەر کاری ڕۆژنامەگەریت کردبێت، ئەوا دەزانیت کە هەندێجار کارێکی زۆر لەسەر بابەتێک دەکەیت، پاشان بەژێر دەستی چەندین کەسی شارەزا و لێهاتوودا دەڕوات، کەچی هەڵەیەکی گەورەی تێدایە و هیچ کەسێکی شارەزا و بلیمەیت هەستی پێنەکردووە، بەڵام کارمەندە نوێیەکانی ئەو بوارە هەستی پێدەکەن. کەوتبوومە نێو گێژەڵووکەیەکی گەورەوە. ئەو وا باوەڕی بەخۆی کردووە کە گۆڤارەکەمان چەندین ساڵە دژی ئەو پیلان دادەنێت، لەبەر ئەو هۆکارە منیش ناتوانم بە هیچ شێوەیەک قەناعەتی پێ بکەم کە بەپێچەوانەوە ئەو گرنگترین و مەزنترین کەسایەتی ناو گۆڤارەکەمانە. ئەم جۆرە زیانە گەورانە کاری ئانێ مارییە، کە بەڕێوبەری بەرهەمهێنانە و وەک منداڵێک زۆر بە ناسکی مامەڵە لەگەڵ کەسە بەناوبانگەکاندا دەکات، بەڵام من وەکو قسەزانێک، زیاتر لە هاوڕێکەی تایتان - کاپتن هادۆک - وە نزیکم هەتا لە

هێنری کیسینجەر. دوای چل و پێنج خولەک لە گفتوگۆکردن، هەستدەکەم بووم بەو فەرشانەی کە لە بەردەرگادا دادەنرێن و خەڵکی قاچی خۆیانی پێ پاک دەکەنەوە..

هەرچەندە ستافەکە حەز دەکەن نانی نیوەڕۆ لەگەڵ بەڕێوبەرەکەماندا نەخۆن، بەڵام بەهیچ شێوەیەک نابێت شتێکی لەو جۆرە ئەنجام بدەن. بەڕێوبەرەکەمان کە لەلای زۆر کەسایەتی جیاواز جیاوازی وەکو جیرۆنیمۆ، لویسی چوارەم و ئایەتوڵا ناسراوە، ماوە ماوە خوانی نیوەڕۆ لەگەڵماندا ساز دەدات، بۆ ئەوەی پێش چوونە پێشەوەی هەر هەنگاوێک پرس و ڕاوێژ بە ئێمە بکات. لە کۆتا نهۆمی باڵەخانەکە و لە ژووری نانخواردنەکەیدا باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە چەند ئەوانـــی بەلاوە گــرنگە و چەنــد خۆشـــیدەوێن. تێبینیەکـانی بە دەربڕینێکی زۆر نایابەوە دەردەبڕێت، و جار هەیە بە دەنگێکی هێمن و ئارام پێیاندا هەڵدەدات و جاری واش هەیە قسە ناشرین و سەرزەنشت نامێنێت پێیان نەڵێت، لەگەڵ ئەوەشدا لەکاتی قسەکردندا جووڵە بە دەموچاوی دەکات و ڕیشی دەخورێنێت و پێدەکەنێت و مرومۆچ دەبێت، بە تێپەڕبوونی کات لە مەبەستی ئەو کردارانەی تێگەشتین. لە کۆتـا خوانـدا تەنهـا ئەوەم لەبیـر دێـت کە وتـی یەکێـک کە هەوادارانـی کۆتـا شـت ئـاوی خـواردەوە، وە وابـزانم لە خوانەکەشدا گۆشـتی خوادبـوو. لەوانەیە هەموویـان نەخۆشـی مانگـای هاریـان گرتبێـت بەس کەس نەیـوێراوە لەوێ باســی بکــات. ئەو ڕۆژە لە ڕاپۆرتەکاندا وا باس بوو کە میتێراندی سەرۆک وەزیران نەخۆشە. هەموو پاریس چاو لەدووی ڕاپۆرتە پزیشکیەکانی بوون، هەتا بزانن ئاخۆ تا کۆتایی هەفتە لە ژیاندا دەمێنیت یاخود نا. وەک دواتر

چۆن دەرکەوت، مانگێکی دیکەی لە ژیاندا مابوو. ناخۆشترین شتی ئەم نـانی نیوەڕوانـانە ئەوەیە هەتـا لە ژیانـدا بمێنیـت ئەویـش هەر بەردەوامە. بۆ ئەوەی کـاتی زیـاترم لەوێ بەفیـڕۆ نەڕوات، بە دزیەوە لە ئۆفیسەکەوە چوومە دەرەوە بێ ئەوەی ماڵئاوایی لە کەس بکەم. دواتر لەدەرەوە شۆفێرەکەم بینی و کاتژمێر چوار بـوو، تـاریکی باڵی بەسەر ئاسمانی پاریسدا کێشابوو.

شۆفێرەکەم وتی "کات درەنگ بووە و زۆرمان پێدەچێ تا دەگەینێ."

منیش لە وەڵامدا وتم "زۆر زۆر داوای لێبووردن دەکەم."

شۆفێرەکەم وتی "من خەمی تۆمە ئەگینا خۆم کێشەم نییە."

بۆ چەند ساتێک بیرم لەوە دەکردەوە کە هەموو ئەو پلانانەی دامناوە هەڵبوەشێنمەوە. پلانـی ڕۆشـتنم بـۆ تەماشـاکردنی شـانۆگەریەک لەگەی دیۆفیل و بەسەربردنی پشووی کۆتایی هەفتەمان بەیەکەوە و خواردنی پەنیر بە گۆشت. بڕیارمدا بەرامـبەر ئەو هۆکارانە بجەنگێم کە دژم دەوەستنەوە و وام لێ دەکەن هێزم لەبەر ببڕێ.

پێم ووت "لە ڕێگا گشتیەکەوە ناڕۆین"

شۆفێرەکەشم وتی "چی بڵێیت ئەوەیە."

سەڕاڕای ئەو هێزە جاویدانیەی هەیەتی، بی ئێم دەبلیوەکە لەسەر ڕێگای پۆنت دێ سورێنسێ زۆر خاو دەڕۆشت و دەتوت قورساییەکی زۆرت لێ بارکردوە. یاریگای قەشە کڵاود تێدەپەڕێنین و دەگەینە نەخۆشـخانەی ڕایمۆنـد پـۆینکەیر لە گـارچێس. کە بەلای ئەم

شوێنانەدا تێدەپەڕین یەکسەر کارەساتێکم بەبیر دێتەوە کە لێرە بەسەرم هاتووە. کاتێک لە لیس کۆندۆرسێنت بووم، مامۆستای وەرزشمان دەیبردین بۆ یاریگای مارچێ لە ڤاوکرێسۆن، هەتا لەوێ ڕاهێنانێکی وەرزشی بکەین کە هەموو جارێ من کەیفم پێ نەدەهات. ڕۆژێک پاسەکەمان خۆی کێشا بە پیاوێکدا کە لە نەخۆشخانەکە هاتبوویە دەرەوە و تەماشای پێش خۆی نەکردبوو. دەنگی ئیستۆپەکە بۆ من ئێجگار نامۆ و سامناک بوو، پیاوەکەش دەمودەست گیانی لەدەستدا و پەنجەرەی پێشەوەی پاسەکەی ئێمەشی خەڵتانی خوێن کردبوو. دوانیوەڕۆیەکی زستان بوو، ڕێک وەکو ئەمڕۆ. هەتا پۆلیس هاتن و کاری خۆیان تەواوکرد شەو داهات. شۆفێرێکی تر ئێمەی بردەوە بۆ پاریس. منداڵەکان لە بەشی دواوەی پاسەکەدا بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گۆرانی "پێنی شەیدس"یان دەوتەوە. تۆ بڵێیت کاتێک دیۆفیل دەبێت بە چل ساڵ کام گۆرانی بەبیر بێتەوە؟

لە کۆتایدا دوای کاتژمێر و نیوێک گەشتینە جێگای مەبەست، گەشتینە ماڵێک کە دە ساڵی ژیانم تێدا بەسەربردبوو. تەم باخچەکەی داپۆشیوە و زۆرجاریش بە دەنگە دەنگی هاواری خۆشی و ناخۆشی و پێکەنینی ئێمە رادەچڵەکی. دیۆفیل لە پێش دەرگاکەدا بە خۆی و جانتاکەیەوە بەدیارمانەوە وەستاوە و ئامادەیە بۆ بەسەربردنی کۆتایی هەفتەکە. دەمویست تەلەفونێک بۆ کەپڵە نوێکەم فلۆرێنس بکەم، بەڵام ڕۆژی هەینی بوو و ئەویش لەماڵی باوکی بوو هەتا شەمە سەردانی کەنیسە بکەن. وامداناوە دوای شانۆگەریەکە قسەی لەگەڵدا بکەم. بێجگە لە حەجەکەی پێشووم، تەنیا یەک جاری دیکە لە ڕێوڕەسمی ئایینی جولەکاندا بەژداریم

کردووە، ئەو جارەش لەماڵی ئەو پزیشکە پیرە تونسیە بوو کە بوو بە مامانی منداڵەکانم.

لەدوای ئەو ساتەوەم بە باشی بەبیر نایەت. لەگەڵ ئەوەشدا لە دواوەی بی ئێم دەبلیوەکەدا دانیشتبووم و تەماشای داشبۆردەکەم دەکرد کە تیشکەکانی ڕۆژ لێی دەدا و ڕەنگێکی مەیلەو پرتەقاڵی پێ دەبەخشێت. مێشکم بە خاوی کار دەکات و زۆر کەم ئەو شوێنە دەناسمەوە کە چەندین جار دەمەقاڵەم کردووە تیایدا. وا هەست دەکەم ناوچاوانم ئارەقە دەکات و هەر کاتێکیش پێشی هەر ئۆتۆمۆبێلێک دەکەوین وا دەزانم پێشی دووان کەوتووین. لە چوار ڕیانی یەکەمدا دەڵێم بە شۆفێرەکە ڕابوەستێت. لە بی ئێم دەبلیوەکە دێمە دەرەوە، ناتوانم لەسەر پێیەکانم ڕا بوەستم، بۆیە دووبارە دەکەومە سەر کوشنەکانی پشتەوەی. یەک بیرۆکەم بە مێشکدا دێت، ئەویش ئەوەیە بڕۆم بۆ لای دایانای ژن خوشکم، کە کاری پەرستاری دەکات. بە نیوە ئاگاییەکەوە بە دیۆفیل دەڵێم خێرا غار بدات و بەپەلە بانگی بکات بۆلام. دوای چەند چرکەیەک دایانا ئامادە دەبێت لە شوێنی ڕووداوەکە. بەپەلە بڕیار دەدات و دەڵێت "دەبێت بە زووترین کات بیگەیەنینە نەخۆشخانە". لە بەختی مندا نزیکترین نەخۆشخانە دە میل لێمانەوە دوورە. ئەم جارەیان شۆفێرەکەم شێوەی گولەیەک لێدەخوڕێت. زۆر هەست بە نامۆیی و غەریبی دەکەم، وەک بڵێی حەبێکی سەرخۆشکەرم قووت دابێت، ئەگەر تەماشای تەمەنیشم بکەیت دەزانیتکە من سەرم لە کاری وا دەرناچێت و پیاوی ئەو ئیشانە نیم. یەک چرکەش بە خەیاڵمدا نایەت بڵێم "لەوانەیە لە سەرەمەرگدا بم." لە ڕێگاماندا بۆ مانتێس، ئۆتۆمۆبێلەکە نەرەی

دێت و یەک ڕیزی درێژ بارهەڵگر دەخەیەنە پشت خۆمانەوە. شۆفێرەکەش بە توندی هۆڕن لێ دەدات تا ئەوانی دیکەش ڕێگەمان بۆ چۆڵ بکەن. دەمەوێت خۆم کۆبکەمەوە و بڵێم "هێواش بڕۆ، کەمێکی دی باش دەبم و ئەوەندە ناهێنێت خۆت تووشی ڕووداوێک بکەیت لەسەری." بەس هیچ دەنگێک لە دەممەوە نایەتە دەرەوە و سەریشم، کە بەسەر ملمدا کەووتوە، ئیدی لە کۆنترۆڵی خۆمدا نەماوە. گۆرانیەکەی گروپی بیتڵسم بەبیر دێتەوە کە بەیانی گوێم لێ گرت. گۆرانیەکە دەیوت ( هەرچەندە هەواڵەکان خەبەری ناخۆشیان پێیە .... وێنەکەیشم بینی......) زوو گەشتینە نەخۆشخانەکە. خەڵکەکە وەکو بڵێی توشی هیستریایەک بووبن بەو ناوەدا دەسوڕێنەوە. بە شەلە شەلە خستمیانە سەر کورسیە پێچکدارەکە. دەرگاکانی ئۆتۆمۆبێلەکە بە ئەسپایی دادەخرێن. ڕۆژێک یەکێک پێی وتم ئۆتۆمۆبێلی باش بە دەرگا داخستنەکەیدا بناسەرەوە. بە لایتە نیۆنیەکانی نێو هۆڵی نەخۆشخانە گێژ و هێڕ بووم. لە بەرزکەرەوەکەدا خەڵکانیکی نامۆ بە من، ورەم دەدەنەوە بەر خۆم و گۆرانیەکەی بیتڵسم بیر دێتەوە کە دەڵێت "کۆتا ڕۆژ لە ژیانی دنیا". دەنگی ئەو پیانۆیەم بەبیر دێتەوە کە لە نهۆمی حەوتەمی باڵەخانەیەکەوە دەکەوێتە خوارەوە. تا ئەو کاتەی بە زەویدا دەدات و تێک و پێک دەشکێت دەتوانم بیر لەوە بکەمەوە ئایا بڕۆین بۆ شانۆگەریەکە یان نا. بەهەرحاڵ، تازە هەر دوادەکەوین. سبەی شەو دەڕۆین. ئەی باشە دیۆفیل بۆ کوێ چووە؟ ئەو ڕستەیە لە مێشکی خۆمدا دەڵێم و دەچمە ناو لەهۆشخۆچوونێکی بێبنەوە.

وا خەریکە هاوین کۆتایی پێ دێت. شەوەکان وردە وردە دەست بە ساردبوونەوە دەکەنەوە، و بۆ جارێکی تر لەژێر بەتانیە ئەستوورەکاندا خۆم مات داوە، ئەو بەتانیانەی لێی نوسراوە "نەخۆشخانەکانی پاریس." هەموو ڕۆژێک کۆمەڵە دەموچاوێکی جۆراوجۆری ناسراو دەبینم، دەموچاوگەلێکی وەکو خزمەتکارەکە و پزیشکی ددانەکە و ئەو پەرستارەی کە تازە بە تازە بووە بە نەنک، لەگەڵ پۆستەچی و ئەو پیاوەی مانگی جونی پێشوو لەسەر سکەی شەمەندەفەرەکە پەنجەی شکاوە. دووبارە دیمەنەکانی ژیانت پێشوم دێنەوە پێشچاوم، دووبارە خەریکە خووە کۆنەکانم دەگرمەوە، ئێستاش یەکەم وەرزی پایزمە لە نەخۆشخانەکە، وەرزەکەش پەیامێکی لەگەڵ خۆی هێناوە، پەیامێک کە پێم دەڵێت ئیدی دەستم بە ژیانێکی نوێ کردووە، ژیانێک لە نەخۆشخانە و لەسەر ئەم جێخەو و کورسیە پێچکدارەم، ژیانێک کە جگە لە هۆڵی نەخۆشخانەکە هیچ شوێنێکی ترم نییە بۆی بڕۆم.

مانگی سێپتێمبەر بە مانای کۆتایی گەشتە هاوینەکان و سەرەتای دەستپێکردنی قوتابخانە و کارە، لێرەش — لە نەخۆشخانەکە — واتای وەرزێکی نوێیە. هەندێک پێشکەوتنم بەخۆمەوە بینیوە. ئێستا دەتوانم گۆرانی کەنغەرە بچووکەکە بچڕم، ئەو گۆرانیەی کە بووەتە شایەتێک بۆ بەرەو پێش چوونەکەم لە قسەکردندا.

کەنغەرەکە لە باخچەی ئاژەڵان هەڵهات.

"ماڵئاوا" کەنغەرەکە هاواری کرد...

دیوارەکەی بە یەک باز بڕی....

بە یەک بازی بەرز چووە ئەودیو....

بەڵام لەم نەخۆشخانەیەدا یەکجار کەم گوێم لە گەڕانەوەی خەڵکیە بۆ سەر کار و لێپرسراویەتیەکەیان.... گەڕانەوە بۆ ئەدەبیات و ڕۆژنامەگەری و قوتابخانە، بەسەرکردنەوەی ڕۆژێکی کارکردن لە پاریس. بەڵام بەمزووانە هەواڵم پێ دەگات، ئەو کاتەی کە هاوڕێکانم دوای گەشتە هاوینەکەیان نەخۆشخانەی بیرکیان بیردەکەوێتەوە و بە چەپکێک یادگاری هاوینەوە دێن بۆ لام. وا پێدەچێت ئیدی دیۆ فیلیش ئەو کالەیانە لەپێ بکات کە لەگەڵ هەر هەنگاو هەڵهێنانێکیدا گلۆپەکانی دادەگیرسێت. دەتوانی لە شەوەزەنگیشدا بیناسیتەوە. ئەم کۆتایی هەفتەیەی مانگی ئۆگەست بە دڵی خۆم چێژ وەردەگرم، لەبەر ئەوە ماوەیەکە خۆشیم لە هیچ شتێک نەبینیوە. هەستێکم هەیە کە هەر لە سەرەتای گەشتەکەمەوە لێرە هەموو شتەکانی دیم لە پێشچاو کەوتووە.

کلاودێ ئانیشکەکانی لەسەر مێزەکەی داناوە و ئەو لاپەڕەیانە دەخوێنێتەوە کە بە ئەسپایی و بە هێمنی لەماوەی ئەم دوو مانگەدا لە نەبوونەوە هێنراونەتە بوون. هەندێ پەڕی تێدایە کە دڵخۆش دەبم بە دووبارە بینینەوەیان. هەندێکیشیان ئێجگار بێ ئومێدم دەکەن. تۆ بڵێیت لە چاپی بدەن و بیکەن بە کتێبێک؟ لە کاتێکدا گوێم بۆ

کـلاودێ شـل کـردووە، تەماشـای قـژە ڕەشـەکەی و ڕوومەتە زەرد هەڵگەڕاوەکانی – کە ئەوەندە خۆر و با خۆی پیاکێشاوە ڕەنگی تێدا نەهێشتووە – و دەمارۆچکە شینەکانی دەستی و ڕاپۆرتە هەڵپرژاوەکانی نێو ژوورەکە دەکەم. لە مێشکمدا وەکو نیشانەیەک بۆ کارێکی قورس و ماندوونەناسی هاوینی هەڵدەگرم. لە مێشکمدا تیانووسە شینەکەی – کە بە دەست و خەتێکی ڕێک و جوان لێی دەنوسێت – و جانتاکەی کە وەکو جانتای منداڵێکی قوتابخانە و کۆمەڵە دەسرێک کە بۆ کۆکەی لەناکاوی من ئامادەی کردووە و جزدانەکەی کە زوو زوو بەدوای دینارێک ئاسندا دەگەڕێت تا قاوەیەک بکڕێت. جزدانەکەی نیوە کراوەیە و کلیلی ژووری هۆتێلەکەیم لێ دیارە، لەگەڵ بلیتێکی میترۆ، سەد فرانکیەک کە چوارجار قەدکراوە و ئەو جۆرە شتانەی کە کەس بەکاری ناهێنێت جگە لەو ئاسمانەوانانەی کە لە جیهانی دەرەوەوە دەیهێنن بۆ ئەوەی بزانن ئەوان چۆن دەژین، و چۆن گەشت و مامەڵە لەگەڵ یەکیدا دەکەن. دیمەنەکە تووشی شڵەژانم دەکات و وام لێ دەکات بچمە ژێر باری بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە. باشە تۆ بڵێی گەردوون کلیلێکی لابێت تا زەنگۆڵە نووقومبووەکەی خۆمی پێ بکەمەوە؟ کە وەکو ئەو شەمەندەفەرەیە کە لە هیچ وێستگەیەکدا نازانێت سرەوتن و وەستان چییە. ئایا بڕە پارەیەک هەیە بتوانم ئازادی خۆمی پێ بکڕمەوە؟ ئایا هیچ شتێک هەیە جگە لەوەی کە لە ئاسمانە، ژیانی من لێرە ڕزگار بکات؟ دەبێت هەمیشە چاولەدووبین. ئیدی منیش بێدەنگ دەبم.

بێرک-پلاگ، جولای – ئۆگەستی ١٩٩٦.

بەرگی پشتەوەی کتێب

لە دیسێمبەری ساڵی ١٩٩٥دا، جین دۆمینیک باوبی، سەرنووسەری گۆڤاری فرێنچ ئێلێ، لە تەمەنی چل و سێ ساڵیدا دووچاری نۆبەی مێشک بوویەوە. بەو هۆیەوە بۆ هەمیشە بە ئیفلیجی مایەوە. ماوەیەک پێش ئەم ڕووداوە بە قسە خۆشی و ژیریەکەی ناوبانگی دەرکردبوو، بەڵام دوای ڕووداوەکە خۆی لە جەستەیەکی مردوودا بینیەوە. پەیوەندی باوبی لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا تەنها لەڕێگەی پێڵوی چاوی چەپیەوە بوو. بلیمەتی ئەم پیاوە لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە بڕیاری دا لەڕێگەی قووچاندنی پێڵوی چاوی چەپیەوە ئەم شاکارە نادیدە سەرنجڕاکێشە، ئەم یادەوەریەی کە سەرشارە لە ڕەوانبێژی، بنوسێتەوە. دوو ڕۆژ دوای لەچاپدانی کتێبەکەی، باوبی کۆچی دوایی کرد. ئەو جەستەی مرد، بەڵام ڕۆحی لە ڕێگەی ئەم کتێبەوە بە هەموو ئەورووپادا بڵاوبوویەوە.

بەرگی پێشەوەی کتێب

پەپوولە

و

زەنگۆڵە نوقومبووەکە

یاداشتێکی خەمناک، شاعیرانە، پڕ لە ئارەزوو و تەوسئامێزی ئەو پیاوەی کە نەیدەویست ڕۆحی بمرێت

جین دۆمینیک باوبی

له دیسێمبه‌ری ساڵی ۱۹۹۵دا، جین دۆمینێك باوبی، سه‌رنووسه‌ری گۆڤاری فرێنچ ئێلێ، له ته‌مه‌نی چل و سێ ساڵیدا دووچاری نۆبه‌ی مێشک بوویه‌وه. به‌و هۆیه‌وه بۆ هه‌میشه به ئیفلیجی مایه‌وه. ماوه‌یه‌ک پێش ئه‌م ڕووداوه به قسه خۆشی و ژیرییه‌که‌ی ناوبانگی ده‌رکردبوو، به‌ڵام دوای ڕووداوه‌که خۆی له جه‌سته‌یه‌کی مردوودا بینییه‌وه. په‌یوه‌ندی باوبی له‌گه‌ڵ جیهانی ده‌ره‌وه‌دا ته‌نها له‌ڕێگه‌ی پێڵوی چاوی چه‌پیه‌وه بوو. بلیمه‌تی ئه‌م پیاوه له‌و کاته‌وه ده‌ستی پێکرد که بڕیاری دا له‌ڕێگه‌ی قووچاندنی پێڵوی چاوی چه‌پیه‌وه ئه‌م شاکاره نادیده سه‌رنجڕاکێشه، ئه‌م یاده‌وه‌رییه‌ی که سه‌رشاره له ڕه‌وانبێژی، بنوسێته‌وه. دوو ڕۆژ دوای له‌چاپدانی کتێبه‌که‌ی، باوبی کۆچی دوایی کرد. ئه‌و جه‌سته‌ی مرد، به‌ڵام ڕۆحی له ڕێگه‌ی ئه‌م کتێبه‌وه به هه‌موو ئه‌وروپادا بڵاوبوویه‌وه.

له بڵاوکراوه‌کانی کتێبفرۆشی مێخه‌ك - زنجیره / ٤٩